زنجیرەی خێزانی سەردەم

THE CHILDREN'S FAITH QUESTIONS

02

# پرسیارە ئیمانییەکانی منداڵان

نموونەی کردارەکی
بۆ وەڵامدانەوەی پرسیاری منداڵان لەبارەی پایەکانی ئیمانەوە




نووسینی:
عبدالله بن حمد الركف

وەرگێڕانی:
ئـالان عومەر سلێمان




# پرسیارە ئیمانییەکانی منداڵان

نموونەی کردارەکی بۆ وەڵامدانەوەی پرسیاری منداڵان لەبارەی پایەکانی ئیمانەوە

ئامادەکردنی: عبدالله بن حمد

وەرگێڕانی: ئالان عومەر سلێمان



چاپی یەکەم ١٤٤٥ك -٢٠٢٤ز



نووسینگەی تەفسیر

بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن

هەولێر - شەقامی ٣٠مەتری تەنیشت ماڵارەی چۆلی

+964 750 818 08 65

www.al-tafseer.com

tafseeroffice@yahoo.com

\ tafseeroffice

ئامادەکردنی پێڕست - نووسینگەی تەفسیر

الرکف، عبدالله بن حمد

پرسیارە ئیمانییەکانی منداڵان نموونەی کردارەکی بۆ وەڵامدانەوەی پرسیاری منداڵان لەبارەی پایەکانی ئیمانەوە،

عبدالله بن حمد الرکف (ئامادەکار). ئالان عومەر سلێمان (وەرگێڕ)

٢٠٠ لاپەڕە،

١٤*٢١ سم

بابەت، فیکری، پەروەردەیی

ISBN: 978-9922-690-46-9

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکانی

هەرێمی کوردستان/ ژمارە سپاردنی (٣١٥)ی ساڵی (٢٠١٩ ) پێدراوە.



دیزایین، نووسینگەی تەفسیر

# پرسیارە ئیمانییەکانی منداڵان

نموونەی کردارەکی

بۆ وەڵامدانەوەی پرسیاری منداڵان لەبارەی پایەکانی ئیمانەوە

نووسینی:
عبدالله بن حمد الركف

وەرگێڕانی:
ئالان عومەر سلێمان

# ناساندنی زنجیرەکە

گەنجی موسڵمان بە گشتی و کۆمەڵگای کوردەواری بە تایبەت؛ ڕۆژانە ڕوبەڕووی بیرۆکەی نوێی نابـاو دروستکراو، پتر ئاڕاستەکراو دەبنەوە. مەبەست لەم بیرۆکە ئاڕاستەکراوانەش، تێکدان و سەرگەردان کردنی مرۆڤ بەگشتی و چەند کۆمەڵگایەك بەتایبەت؛ بۆ مەرامی بڵاوکردنەوەی چەندەها بیرۆکەی بێژمارە.

لەم سۆنگەیەوە نووسینگەی تەفسیر وەك کاری هەمیشەیی خۆی بە ئەرکی زانیوە بەڕووی هەر بیرۆکەیەکی نابـاو هەڵبشاخێ کە ئاڕاستەی کۆمەڵگاکەمان دەکرێت.

لەم ڕووەوەش، هەڵساین بە وەرگێڕان و نووسینی زنجیرەیەك کتێبی سادە و ڕەوان، بەجۆرێك خوێنەرانی قۆناغی پێشکەوتووی بنەڕەتی و ئامادەیی بتوانن بە ئاسانی هەرسی بکەن و تەنانەت زنجیرە کتێبەکە بەجۆرێك دیزاین کراوە؛ کە خوێندکارانی زانکۆ و مامۆستا و پسپۆڕانیش سوودی گەورەی لێ ببینن و ببن بە هەوێنی سەرچاوە گرنگەکانیان.

# پێشەکی

منداڵ نموونەی درەختێکە، کاتێك لە زەوییەکی گونجاودا بڕوێت، کەشوهەوایەکی تەندروستی بۆ بڕەخسێت، خۆراکی باشی لە کاتی گونجاودا پێ بدرێت" ئەوکات دەبێتە درەختێکی بەرزی بەردار... وەچەخستنەوە بە بەراورد بە پەروەردە کارێکی زۆر ئاسانە، چونکە ئەو کاتەی منداڵ دێتە دونیاوە پێکهاتەی دروستبوونی جەستەیی تەواو بووە، بەڵکو پێدانی خواردن لە خستنەوەی وەچە ئاسانترە، بەڵام ئەو کارەی، کە گرنگ و پڕ بایەخە" بریتییە لە چاودێریکردنی و ئاراستەکردنی.

لە بەخششەکانی پەروەردگار توانایەکی لەڕادەبەدەری فێربوونی بە منداڵ بەخشیووە، بەڵام ئەم توانایە بەستراوەتە بە هەستکردنی منداڵەکە بە ئارامیی دەوروبەری لە لایەك و بوونی مامۆستایەکی دڵسۆزی (بەتوانا) لە لایەکی دیکەوە. جا هەر کاتێك ئەم دوو لایەنە دەستەبەر بوون، ئەوکات منداڵ دەگات بە ئاستێکی عەقڵی و زانستیی زۆر باش.

منداڵان لە بنەڕەتی دروستبوونیانەوە زیرەکن، ئەوان دروستکراوی خوای گەورەن، ڕۆژ دوای ڕۆژ بازنەی سەرسامیی زانایان بەهۆی دۆزینەوەی زانستیی نوێیان لە بەرامبەر مرۆڤدا فراوانتر دەبێت، هەروەها لە بەرامبەر بەخششە نائاساییەکانی پەروەردگاردا بۆ مرۆڤ.. بەڵام خێزانی پێکهاتوو لە دایك و باوك، بەشدارن لە زیاکردن، یان سنووردارکردن، یان تەنانەت لێسەندنەوەی ئەم زیرەکییەدا.

ئەگەر ئایین بنەمای جیاکردنەوەی مرۆڤ بێت لە ئاژەڵ، ئەوا پێغەمبەر ﷺ جەختی لەوە کردووەتەوە، کە مرۆڤ لەسەر فیترەت لە دایك

دەبێت، بەڵام ڕوونی دەکاتەوە، ئەگەر لە فیترەتی پاك لا بدات، ئەوە دایکان و باوکانن ڕۆڵی گەورەیان هەیە لەم بەلاڕێدابردنەدا. ئەگەرچی ئەمە واتا ڕاستەوخۆکەی فەرموودەکەیە، بەڵام لە لایەکی ترەوە ڕۆڵی دایك و باوك لە چەسپاندنی لایەنی ئایینی بۆ منداڵ دەردەخات، سەبارەت بە پاراستنی ئەو فیترەتەی لەسەری لەدایك بووە.

لە سەردەمانی ڕابردوو دایکان و باوکان تاکە سەرچاوەی بەدەستهێنانی زانیاریی منداڵ بوون لە قۆناغەکانی سەرەتایی تەمەنیدا، لە دوای ئەوان قوتابخانە دەهات، کە بۆ منداڵ دەبووە سەرچاوەی دووەم، سەرباری مانەوەی خێزان (دایك و باوك) وەك سەرچاوەی سەرەکی، تا ئەو کاتەی منداڵ دەگەیشتە قۆناغی هەرزەکاری و بۆ مەبەستی سەپاندنی ناسنامەی خۆی بە دوای سەرچاوەی تردا دەگەڕا" تەنانەت لەو قۆناغەیشدا کەشوهەوای خێزانی و مامەڵەی نەرمونیان بە خۆشەویستی و ئارامی، وای لەو هەرزەکارە دەکرد لە دایك و باوکی نزیك بێت.

لەگەڵ تەقینەوەی تەکنەلۆژیا و ڕاگەیاندن، ڕەشەبای گۆڕانکارییەکی بەهێز هەڵیکرد، بازاڕی زانیاری خرایە مەزاد، لەگەڵ زۆربوونی کەسانی نادڵسۆز، کە ئەمەیش کاریگەریی گەورەی لەسەر گەنجان دروستکردووە. ئەوانەی لە تینوێتیی زانیاریدا دەژین، کۆمەڵە پرسیارێکی قۆناغی منداڵی و هەرزەکاری گەمارۆی دەدان بێ ئەوەی کەسێك ببیننەوە وەڵامیان بداتەوە، لەوانەیشە بەهۆی هەستیاریی ئەو جۆرە پرسیارانەوە ڕووبەڕووی سەرکوتکاریی دایك و باوکیان، یان یەکێکیان ببنەوە، یان لەوانەیشە دایك و باوك توانای وەڵامدانەوەی بڕواپێکەریان نەبێت" یان بەرامبەر زنجیرە پرسیارەکانی منداڵەکانیان لاواز بن، بەڵام ئەم سەرکوتکارییە کۆتایی بە پرسیارە هەڵواسراوەکان ناهێنێت، تا ئەو کاتەی لە ڕێگەی گەڕانیدا دەستی دەگات بە یەکەم پەنجەرەی زانیاری.

مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو تەقینەوە تەکنەلۆژی و ڕاگەیاندنە بە

ئارەزووخواستن و هەڵبژاردن نییە، بەڵکو منداڵان بـە چـەندان قۆنـاغ بـە پێش دایك و باوکیان کەوتن، ئەمەیش بابەتەکەی ئـاڵۆزتر کـردووە، وای کردووە بەرپرسیارێتیی پەروەردکردن قورستر بێت و پێوستی بە میکـانیزم و لێهاتوویی گونجاو هەبێت لەگەڵ ئەم قۆناغەدا.

لە هـەمان کاتـدا لێـرە و لـەوێ چـەند نموونەیـەك لـە گـەنج و لاوان سەرهەڵدەدەن، کە گاڵتە بە کۆمەڵگە دەکەن، خۆیان بە پۆشاکی وەهمـی داپۆشـیووە، لەوانەیشـە هەنـدێکیان بـوێریی ئـەوەیان تێـدا بێـت نـاوی خۆیشیان ئاشکرا بکەن. ئەمانە دەستیان کردووە بە ورووژانـدنی گومـان سەبارەت بە چەند لایەنێك و چەند دەقێکی ئایینی، بەڵکو ئەوەی ئاسـتی گاڵتەپێکردنەکەی زیاد کردووە ئەوەیـە، کـە ئـەوان بەئاشـکرا پۆشـاکی ئیسلامییان داکەندووە... زۆربەی ئەوانە، لەوانەیە ئەم بیروباوەڕەیـان لـە دڵدا نەچەسپیبێت هێندەی ئەوەی، کە بریتی بێت لە دەربڕینی تووڕەییـان بەرامبـــەر ئـــەو کەشـــوهەوایەی لێـــی ژیـــاون، یـــان بەرامبـــەر ئـــەو سەرکوتکارییەی بەرامبەریان ئەنجامدراوە.

پەروەردەی ئیمانی بەشێکی بنەڕەتییە لە پەروەردەی منـداڵ، بـەڵکو پاشـــخانی ســـەرجەم لایەنـــەکانی تـــری پەروەردەیـــە بـــۆ ئـــەوەی بیکاتـــە پەروەردەیەکی ڕاستەقینە و کارا. منداڵ - بە زیرەکییە فیترەتییەکـەی - هەرکاتێك زانیـاریی ئـاینی بـۆ دێـت، کۆمەڵـە پرسـیارێکی زۆری بـە مێشـکدا دێـن، بۆیـە زۆر گرنگـە - بەتایبـەت کاتێـك پرسـیارەکە زۆر پێویست بێت و لەناکاو نەبێت - دایك و باوك بەبایەخەوە گوێی بۆ بگـرن و بۆ وەڵامدانەوەی تێبکۆشن.

بەڵام ئاساییشە، کە زۆرێك لە دایکان و باوکـان زانیـاریی تـەواویان نەبێت، یان هەموو دایك و باوکێك شێوازی بڕواپێکـەریان نـەبێت، بۆیـە لەوانەیە لـە دەریـای خەمەکانیـدا نغـرۆ ببێـت و ماوەکـەی لـێ تەسـك ببێتەوە، کە پێویستە تیایدا بگەڕێت و لەو ماوەیـەدا وەڵامەکـە ئامـادە

بکـات" بەتایبـەت کاتێـك پرسـیاری منـداڵان ڕێکوپێـك نابێـت و بـە شێوەیەکی هەڕەمەکی دەبێت، ئەویش لەمیانەی مامەڵـەکردنی لەبابەتـە بینراو و بیستراوەکاندا.

لێرەدا برای بەڕێز (عبدالله بن حمد الركف) کارێکی باشی کرد کاتێك ئەم کتێبەی ئامادە کرد، ئەو هەست بە پێویستیی خـەڵکی دەکـات بـۆ بابەتــە، جــا بــەهۆی دەرکپێکردنــی لایــەنی ئیمــانی بێــت، یــاخود هەستپێکردنی بێت بە لایەنی سەرقاڵیی دایکان و باوکـان و پێویسـتییان بە کارێکی لەم جۆرە.

لە کتێبەخانەکانماندا کتێبێکی زۆر لەسەر ئـەم بابەتـە هـەن، بـەڵام هەندێکیان بەردەست نـین، هەنـدێکی دیکەیشـیان هـیچ پەیوەنـدیان بـە بابەتەکەوە نییە، تەنیا ناونیشانەکەی نەبێت، هەندێکی تـریش بـاس لـە لایەن و بواری تر دەکەن.. لێرەدا ئەم کتێبە هەوڵیـداوە هەرچـی لـەبارەی ئەم بابەتەوە نووسراوە بیگەیێنێت، هەروەها ببێتـە کتێبێکـی گشـتگیر.. بەر لەمەیش بە کارهێنانی شێوازی گونجاوی بڕواپێهێنەر بـۆ قۆناغـەکـە، وای کردووە بە ڕوونی و ئاسانی لێی تێبگەیت.

خوای گەورە نووسەر سەرکەوتوو بکات و وای لێ بکات هەمیشـە بـە نووسینەکانی سوود بگەیێنێت.

وصلى الله على نبينا محمد، وعلى آله وصحبه أجمعين..

**د. عبدالعزيز بن عبدالله المقبل**

**مامۆستا لە زانکۆی (القصيم) و ڕاوێژکاری پەروەردەیی و خێزانی**

# پێشەکی..

هەندێ کەس قۆناغی منداڵی بە (نیشانەی پرسیار)ی زیندوو وەسف دەکەن، منداڵ لە تەمەنی بچووکیدا ئارەزوویەکی زۆر گەمارۆی دەدات لەبارەی زانین و دۆزینەوە و فێربوونی هەرشتێکی نوێوە.

باوکان بەداخەوە بەهۆی بارودۆخی ژیان و هەوڵدانیان بۆ بەدیهێنانی ژیانێکی باش بۆ منداڵەکانیان، زۆرجار لێیان بێئاگان، هەندێ جار خۆیان لە پرسیارەکانیان دەدزنەوە، یان خۆیانیان لێ نەزان دەکەن" یان بەتوندی وەڵامیان دەدەنەوە، یاخود داوایان لێ دەکەن واز لە چەنەبازی بهێنن، یان پرسیارەکان شەرمەزارکەرن و وەڵامدانەوەیان قورسە، یاخود پێیانوایە وەڵامەکان لە ئاست هۆشیاریی منداڵەکاندا نین.

بێگومان ئەم کارەیش بەخراپی بەسەر منداڵدا دەشکێتەوە، بەوپێیەی لە ڕەخساندنی هەلی گەورە بێبەشیان دەکات، گەرچی ئێمە وەك پسپۆڕان و زانایان بەردەوام دەڵێین پێویست ناکات لە پرسیاری منداڵەکان بێزار بین، تەنانەت ئەگەر بەدرێژایی ڕۆژیش پرسیار بکەن، چونکە لەمیانەی ئەو وەڵامەی وەریدەگرن ڕێژەیەکی زۆر لە بەها و خوڕەوشتی پەروەردەییان بۆ دروست دەبێت" دەرکرپێکردنیان فراوان دەبێت، زیرەکییان پێش دەکەوێت، ئەمەیش وا دەکات لایەنی عەقڵی لە لایان گەشە بکات.

تەرخانکردنی نیو کاتژمێر لە لایەن دایکان و باوکان بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارە سادەکانی منداڵان و گوێگرتن لە خەمە بچووکەکانیان و سەیرکردنی چاوە بێگوناهەکانیان، بەدڵنیاییەوە بۆ قۆناغەکانی داهاتوو پاڵپشتییەکی دەروونی دەبێت بۆیان، یارمەتیدەر دەبێت بۆ دروستکردنی کۆمەڵە بەهایەك لە لایان، چەمك و بنەما ئاینییەکان بەدەست دەهێنن، کە دەبنە دروستبوونی ناسنامەی ئایینی ئەوان.

پرسیاری منداڵان تەنیا ئەوە نییە، کە بە وەڵامدانەوەیان حەز و ئارەزووەکانیان تێر بکات، بەڵکو بریتییە لە دڵخۆشبوون و تێرکردنی حەزی منداڵ بە ستاییش و چاودێریکردن" هەروەها ڕاکێشانی سەرنجی دەوروبەر و سەپاندنی خود.

هەمووومان دەزانین، ئەو وەڵامە سادانەی لە دایك و باوکان بەدەستی دەهێنین، خودی ئەو وەڵامانە مەبەست نین، لەسەر ئەوانەیش پاشخانی زانیاریی خۆمان بنیاد نانێین، بەڵکو ئەوەی لە مێشکماندا دەمێنێتەوە" بایەخپێدان و دەستی دایك و باوکمانە، کە لەسەر شانمانی دادەنێن بۆ ئەوەی هەست بە ئارامی و پاڵپشتی بکەین، ئەوەیشی لە بیرماندا دەمێنێتەوە وەڵامەکان نین، بەڵکو زەردەخەنە و ستاییش و لاواندنەوە و بڕوا و بایەخپێدانەکانن.

بۆیە پەروەردەناسان ئامۆژگاری دەکەن ستراتیژییەتی گفتوگۆ و دەمەتەقێ لە وەڵامدانەوەی پرسیاری منداڵەکاندا بەکاربهێنرێت، بەوپێیەی پرسیاری منداڵ بە پرسیارێکی تر وەڵام دەدرێتەوە، ئەم ستراتیژیەتە بە باشترین ئامرازی پەیوەندیبەستن دادەنرێت، منداڵەکە لەمیانەی ئەم ڕێگەیەدا دەگاتە ئامانج و دۆزینەوەی ڕاستییە شاراوەکان"

هاوسەنگیی زانیاریی خۆی بەدەستدەهێنێت، حەزی زانین و دۆزینەوەی تیژ دەبێت، ئەمە سەرباری ئەوەی گیانی خۆشەویستی و دڵخۆشی و ڕێزگرتنی خود و کەسانی تری لە لا دروست دەکات.

هەروەها گرنگیپێدانی باوکان و گەورەکان بۆ وەڵامی پرسیاری منداڵەکان، دەیانپارێزێت لە وەڵامی سەرلێشێواو و ئاڵۆز، کە لەوانەیە لە لایەن خەڵکانی تر و سەیرکردنی بەرنامە و کتێب و ماڵپەرەکان بەدەستی بهێنن، یان بەدەستهێنانی هەندێ شت، کە لەگەڵ تەمەن و ڕۆشنبیریی منداڵ گونجاو نییە و کاریگەریی گەورەی لەسەر عەقڵیان دەبێت.

لێرەدا گرنگیی ئەم کتێبەی بەردەستمان دەردەکەوێت، ئەم کتێبە بەشداری دەکات لە کردنەوەی ئەو گرێکوێرەیەی، کە ڕووبەڕووی پرسیاری منداڵان دەبێتە لە گرنگترین ئەو لایەنانەی پێی کاریگەر دەبن، ئەویش لایەنی باوەڕ و عەقیدەییە" هەروەها نموونەیەکی کرداری لە چۆنیەتیی وەڵامدانەوەی پرسیارە پەیوەندیدارەکان بە بیروباوەڕ پێشکەش دەکات.

ئەم کتێبە نموونەی باخچەیەکی بەردارە، کە لە هەر بێستانێك گوڵێکی هەڵگرتووە. پڕبایەخترین شت، کە لەبارەی پەروەردەی ئیمانیی منداڵ، گەشەی ئایینی، تەوەرەکانی پەروەردەی ئیمانی و پایەکانی، شێوازەکانی پەروەردەیی بۆ چاندنی ئیمان و تایبەتمەندییەکانی پەروەردەکار نووسرابێت" ئەم کتێبە پێشکەشی کردووە.. هەروەها پرسیارەکانی منداڵان و هۆکارەکانیان و چۆنیەتیی وەڵامدانەوەی لەخۆگرتووە. لە کۆتاییدا نموویەکی لە وەڵامی پرسیاری منداڵان ئامادە کردووە، کە پەیوەندییان بە بیروباوەڕەوە هەیە، سووربووە لەسەر ئەوەی ئەم وەڵامانە نموویەکی هەستیاری لەخۆبگرن بۆ ئەوەی منداڵان لێی

تێبگەن" هەروەها کورت و پوخت، بۆ ئەوەی لەسەر دایك و باوکان نەبێتە بارقورسی...

لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە من و ئێوە سەرکەوتوو و سەرفراز بکات.

**د. منى رجب صابر**

**پزیشکی دەروونناسیی پەروەردەیی لە زانکۆی (القصیم).**

# پێشەکی...

**إن الحمد لله رب العالمين، والصلاةُ والسلام على أشرف الأنبياء وأفضل المرسلين، نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين، أما بعد..**

ساڵە سەرەتاییەکانی تەمەنی منداڵی گرنگییەکی لەڕادەبەدەریان هەیە لە دروستکردنی دیدگای منداڵدا بۆ بوون، بەوپێیەی ئەو چەمکانەی لەو قۆناغە ناسکەدا لە مێشکی منداڵدا دەچێنرێن، کەسایەتیی مرۆڤ لە هەموو ڕوویەکییەوە دروست دەکەن، کە پێویست دەکات لەگەڵ پێداویستییە دەروونی و کۆمەڵایەتی و ئایینییەکانی منداڵەکەدا گونجاو بێت" ئەمە بۆ بنیادنانی منداڵ گرنگە، کە یارمەتیی دەدات بە خۆڕاگری ڕووبەڕووی نارەحەتییەکانی ژیان ببێتەوە، وەك کەسایەتییەکی هاوسەنگ و بەبەرهەم و چالاك بە ڕێگەدا بڕوات. منداڵ لەمیانەی ئەو شتانەی دەیانبیستێت و دەیانبینێت، نموونەی تایبەتی خۆی لەم جیهانەدا بنیاد دەنێت. ئەوەی دەمێنێتەوە دوای ئەم قۆناغە، تەنیا بریتی دەبێت لە پرۆسەی چاککردنەوە و پێشخستنی ئەو دیدگا بنەڕەتییەیە، کە پێشوتر بۆی دروست بووە.

ئەو سەرچاوەی زانیارییەی، کە منداڵ لەم تەمەنەدا پشتی پێ دەبستێت، دایك و باوکییەتی، بۆیە ساڵحبوونی منداڵ بەستراوەتەوە بە ساڵحبوونی پەروەردەی دایك و باوکانەوە، چونکە ئەوان بەرپرسن لە فێرکردنی نەوەکانیان. هەر بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: **(كُلُّكم راعٍ وكُلُّكم مسؤولٌ عن رَعيَته)**.[1]

---

[1] بوخاری (٢٥٥٨) و موسلیم (١٨٢٩) گێڕاویانەتەوە.

واتــە: "هــەمووتان شــوانن و هەموویشــتان لــەو شــوانییەتییە بەرپرســیارن". بۆیــە ئــەم بەرپرســیارێتییە پێویســتی بــە گرنگیپێــدان و تێکۆشان لە بواری پەروەردە و فێرکردن هەیە.

ئێمــە لــە ســەردەمێکدا دەژیــین ئــارەزوو و گومانــەکان (الشــهوات والشــبهات) زۆر بــوون، بۆیــە پێویســتە لەســەر دایکــان و باوکــان لــە پــەروەردەکردنی منداڵەکانیانــدا تێبکۆشــن بــە تێکۆشــانێك پڕاوپــڕ لــە ڕاستگۆیی و پێداگیری و تواناسەرفرکردن، چونکە لەوانەیە دەنکە تۆوێك، کە باوکان لــە دەروونــی منداڵــدا دەیچــێنن" بــەر بگرێــت بــە کــارێکی بەردەوامی بۆ دایکــان و باوکــان، تەنانــەت دوای مردنیشــیان، ئــەوکات منداڵەکە دەبێتە ئەو سەدەقە جارییەی، کە چاکەکەی دوای مردنیش هەر دەمێنێت، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (**أو ولدٌ صالِحٌ يدعو له**).[1]

واتە: "منداڵێکی ساڵح دوای مردنی، دوعای بۆ بکات".

منــداڵان لــە پێــڕی ڕاســپاردەی خــوای گــەورەن بــۆ بــاوان، وەك دەفەرموێت: ﴿ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِيٓ أَوۡلَٰدِكُمۡۖ ﴾ النساء: ١١.

واتــە: (ئــەی کۆمــەڵی دایکــان و باوکــان) منداڵــەکانتان لای ئێــوە ئەمانەتن، خوای گــەورەی بــە ئێــوەی ســپاردوون، بــۆ ئــەوەی ئێــوە بــە ئەنجامدانی کاری بەرژەوەندییە ئایینی و دونیاییەکانیان هەڵبستن، فێریان بکــەن و پــەروەردەیان بکــەن و لــە خراپــە بیانگەڕێننــەوە و فــەرمانی

[1] موسلیم گێڕاویەتییەوە (١٦٣١).

بەندایەتیی خوای گەورە و لەخواترسانی بەردەوامیان پێ بکەن. وەك پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ ﴾ التحريم: ٦

واتە: "ئەی ئەو کەسانەی، کە باوەڕتان هێناوە خۆتان و کەسوکارتان بپارێزن لە ئاگرێك، کە سووتەمەنییەکەی خەڵك و بەردە".

بۆیە منداڵان لای باوان سپاردەن، ئیتر یان ئەوەتا مافی تەواوی ئەم سپاردەیە دەدەن، یان بە زایەی دەدەن، ئەوکات شایەنی سزا و تۆڵەن" ئەمەیش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خوای گەورە لە دایك و باوك بۆ منداڵەکانیان بەبەزەییترە، چونکە سەرباری سۆز و بەزەیی دایکان و باوکان بۆ منداڵەکان، کەچی خوای گەورە هێشتا ئامۆژگارییان لەبارەیەوە دەکات.[(١)]

هەر لەسەر ئەمە، ئەگەر پەروەردەی منداڵ لەناو خێزاندا بە شێوەیەکی باش بوو، ئەوکات دەتوانێت لەگەڵ دونیای دەرەوەدا بە باشترین شێوە مامەڵە بکات، بەڵام هەر غیابێك هەبێت لە ڕۆڵی خێزان لە پەروەردەکردنی منداڵ و گۆشکردنی بە پەروەردەکردنێکی ئیمانیی دروست، ئەوە دەبێتە هۆی دروستبوونی منداڵێك، کە هەرچی ڕەفتاری جوانە لەدەستی بدات.[(٢)]

---

(١) تيسير الكريم الرحمن فى تفسير كلام المنان، السعدى (ص١٦٦).

(٢) سەیری کتێبی (الأسرة ودورها في تنمية القيم الاجتماعية لدى الطفل في مرحلة الطفولة المتأخرة)ی (حسين عزی) بکە. نامەی ماستەر لە زانستی دەروونناسی - زانکۆی تیزی وزو، جەزائیر، (لا ٢٢).

پەروەردە تەنیا بریتی نییە لە ڕاستکردنەوەی هەڵەکان، بەڵکو لە هەمان کاتدا بریتییە لە دەرسدان و فێرکردن و نیشاندانی بنەماکانی ئاین و حوکمە شەرعییەکان - بەرکاهێنانی ئامرازی جۆراوجۆر بۆ چەسپاندنیان لە دەروونیاندا - لە نموونەی پێگەیاندن بە شێوازی ڕابەرایەتی و ئامۆژگاریکردن و چیرۆکگێڕانەوە و ڕێگەی تر[1]، بۆ ئەوەی لە کۆتاییدا کەسایەتییەکی هاوسەنگی چالاك بۆ ژیان و بۆ کۆمەڵگە دەربچووێنین.

ئەم کتێبە کراوە بە دوو بەشەوە: بەشی یەکەم (**دەربارەی پەروەردەی ئیمانی**)، کە کۆمەڵێك بنەما و ڕێسای لەخۆگرتووە - بە پشتیوانیی خوا - یارمەتیدەری دایکان و باوکان دەبێت بۆ پێگەیاندنی منداڵەکانیان.. بەشی دووەم (**دەربارەی نموونەی کرداری بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارە ئیمانییەکانی منداڵان**). ئەم بەشە کۆمەڵێك پرسیاری باوی لەخۆگرتووە بۆ چەند تەمەنێکی جیاوازی منداڵان، بەتایبەت ئەوەی پەیوەندیدارە بە شەش بنەماکانی باوەڕ، هەروەها ڕوونکردنەوەی چۆنییەتیی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم جۆرە پرسیارانەدا.

خوای گەورە پشتیوانکارە، هەر ئەوە ڕێنیشاندەرە بۆ ڕێگەی ڕاست.

**عبدالرحمن بن حمد الركف**

---

[1] سەیری کتێبی (الدعوة مهارات وفنون)ی شحاته صفر بکە، (لا ٢٧١).

# بەشی یەکەم
# دەربارەی پەروەردەی ئیمانی...

پەروەردەکردن پێویستییەکی مرۆڤایەتییە لە پێویستییەکانی بنیاندنانی مرۆڤ، بریتییە لە ئامرازی دروستکردنی منداڵ و پێگەیاندنی لە هەموو بوارەکانی ژیاندا، چونکە لەمیانەی پەروەردەکردندا کەسایەتیی کۆمەلایەتی و زانستی و دەروونی و تەندروستیی منداڵ بنیاد دەنرێت.

پێش ئەوەی قسە لەسەر پەروەردەی ئیمانی و گرنگییەکی بکەین، باشترە پێناسەی چەمکی (پەروەردە) بکەین، بزانین خەڵکانی پەروەردەناس چییان دەوێت؟

## چەمکی پەروەردە:

پەروەردە پرۆسەیەکی ئامانجدارە و کۆمەڵە ڕێسا و یاسایەك ڕێکی دەخەن، کار دەکات بۆ دروستکردنی خوڕەوشتی ڕێك و جوان ئەویش لە ڕێی ڕێنوێنیکردن و ڕۆشنبیکردن و پێگەیاندنەوە. پەروەردە گرنگی دەدات بە پارێزگاریکردن لە فیترەتی منداڵ و چاودێریکرنی، گەشەپێدانی بەهرە و ئامادەباشییەکان، پاشان ئاراستەکردنی ئەو فیترەت و بەهرەیە بەرەو کەماڵبوون و تەواوبوون، کە هاریکاریی ئامادەکردنی مرۆڤی ساڵح

دەکات بۆ ئاوەدانکردنەوەی دونیا.[1] بۆیە پەروەردە ئەو ئامرازەیە، کە سەرکردە بۆ هەموو بوارەکانی ژیان دروست دەکات.[2]

## گرنگیی پەروەردەی ئیمانی:

ئیمان (یان باوەڕ) حەقیقەت و پرسە گەورەکەی بوونی مرۆڤە، دووڕێیانێکە لە ڕێڕەوی ژیانی دونیادا: ﴿ فَمِنْهُم مَّنْ ءَامَنَ وَمِنْهُم مَّن كَفَرَ ﴾ البقرة: ٢٥٣ لەسەر ئەو بنەمایە کار و کردەوە و ڕەفتاریان بنیاد دەنرێن، هەر ئەوەیشە جیاکەرەوەی دەرئەنجامەکانیانە لە ڕۆژی دواییدا.[3] یەکێك لە قۆناغە جیاکانی تەمەنی مرۆڤ، بریتییە لە: قۆناغی منداڵی، چونکە ئەوەی لەو قۆناغەدا لە دەروون و مێشکی منداڵدا دەچێنرێت لە بیروباوەڕ و خوڕەوشت و بەهاکان، ئەستەمە - لەوانەیە زۆریش قورس بێت - بگۆڕدرێت، چ جای لە ڕەگوڕیشە دەرهێنانی، بۆیە لەوانەیە شوێنەوارەکەی لەسەر ئەو تاکە بەدرێژایی تەمەن بمێنێتەوە.[4]

پەروەردە - بەکۆی گشتی - پرۆسەی گرنگیپێدانە، هیچ پەروەردەیەك بوونی نییە بەبێ گرنگیپێدان، باشترین بواریش، کە ئەو گرنگیپێدانەی بۆ تەرخان بکەیت بواری چاندنی ئیمانە. ئێمە لە سەردەمێکداین تێکرای بایەخپێدانی توێژەران ڕووەو لایەنی عەقڵی و جەستەییە، بە

---

[1] سەیری (التربية الإسلامية أصولها ومنهجها ومعلمها)ی عاطف السيد بکە، (ل ١٣). هەروەها سەیری (التربية الإسلامية والمفهوم)ی د.صالح أبو عراد بکە، (ل ٢٧).

[2] سەیری (التربية النبوية)ی د.محمد الدويش بکە. (ل ١٠).

[3] (غرس أصول الإيمان في نفس الطفل د. شريفة الحازمي) بکە، (ل ٥).

[4] (غرس أصول الإيمان في نفس الطفل د. شريفة الحازمي) بکە، (ل ٢١).

پشتگوێخستنی لایەنی ئیمانی و ڕۆحی، ئەو توێژەرانە تیژی نامەکانیان بەرەو ئاراستەی هێنانەدیی سەرفرازی و سەرکەوتنی دونیاییە بە پێوەرە مادییەکان، بەبێ بایەخدان بەو چاکسازییەی، کە دەبێتە هۆی بەختەوەریی ڕۆژی دوایی" ئەمەیش وا دەکات لەم ڕووەوە بۆچوونی ئێمە لە پەروەردە زۆر جیاواز بێت لەوان.[١]

ئاشکرایە پەروەردەی ئیمانی لە ئیسلامدا یەکێکە لەو پایانەی بنیادی پەروەردەیی سەردەمی پێغەمبەرایەتیی لەسەر دروستکراوە، (ابن عمر) ﷺ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، کە فەرمووی: **(كلكم راعٍ، وكلكم مسؤول عن رعيته، الإمام راع ومسؤول عن رعيته، والمرأة راعية في بيت زوجها ومسؤولة عن رعيتها).**[٢]

پێغەمبەر ﷺ هۆشداری دەدات لە گەورەیی ئەو بەرپرسیارێتییەی خراوەتە سەرشانی هەر تاکێك، لە هەمان کاتدا - بێگومان - لەو بەرپرسیارێتییەی هەیشیەتی لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکرێت، کە ئایا چیی کردووە بۆ ئەوانەی لە ژێر سایەی ئەودان؟

هەر لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕدرێتەوە، کە دەفەرموێت **(ما مِن عبد يسترعيه اللهُ رعيةً، فلم يُحطها بِنُصحِهِ، لم يَجِدْ رائحةَ الجنة).**[٣]

واتە: "هەر بەندەیەك، کە خوای موتەعال بەرپرسیارێتیی خەڵکی پێ بدات، بەڵام ئەو ئامۆژگارییان نەکات، ئەوا بۆنی بەهەشت ناکات".

---

[١] سەیری (القواعد العشر: أهم القواعد في تربية الأبناء) بکە، نووسینی: د. عبدالكريم بكار، (لا ٢١-٢٢).

[٢] بوخاری (٢٥٥٨) و موسلیم (١٨٢٩) گێڕاویانەتەوە.

[٣] بوخاری گێڕاویەتییەوە (٧١٥٠).

ئەمــە ئاماژەیەکــە بــۆ گرنگیــی پێشکەشــکردنی ئامۆژگــاری بــە شێوەیەکی ڕاستگۆیانە و دەستپاکی، بە جۆرێك ئەو ئامۆژگارییە گشتگیر بێت و سەرجەم بەرژەوەندییــەکانی کەســی ئامۆژگــاریکراو لــەخۆبگرێت. ئەوەی لەوبارەیەوە وتراوە فەرمایشتی (ابن عمر)ـە ﷺ کە دەفــەرموێت: **"منداڵەکەت پەروەردە بکە، چــونکە تــۆ بەرپرســی لــەو، کــە بــە چــی پــەروەردەت کــردووە؟ چــیت فێرکــردووە؟ منداڵەکــەیش بەرپرســە لــە چاکەکردن بەرامبەرت و ملکەچبوونی بۆت".**[1] لێرەدا (ابــن عمــر) ﷺ جەخت لەوە دەکاتەوە، کــە بەرپرســیارێتیی یەکــەم دەکەوێتــە سەرشــانی دایکان و باوکان، ئەوان سەرچاوەی یەکەمی فێرکــردن و پــەروەردەکردنن. دەڵێن: "پەروەردەکردن باشترە لە بەخشین". دەوترێت: "پیاو منداڵەکەی پــەروەردە بکــات، باشــترە لــەوەی خێرێــك ببەخشــێت بــە ئەنــدازەی جامێك".[2] هەروەها باس لەوە کــراوە، کــە پــەروەردەکردنی منــداڵێکی بەڕەوشت، باشترە لە هەموو جــۆرە بەخشــینێك، وەك دەوترێــت: "هــیچ بەخشینێك لە ڕەوشــتێکی جــوان باشــتر نییــە، کــە باوکێــك بیــدات بــە منداڵەکەی".[3] هەموو ئەم دەقانە ئەوە ڕوون دەکەنەوە، کە گرنگیدان بە پەروەردە و فێرکردن، لە پیرۆزترین و باشترین ئەو شتانەن دایکان و باوکان دەیانبەخشنە منداڵەکانیان.

پێشتر ئێمە لە ژینگەیــەکی نیمچــەداخراودا منداڵــەکانمان پــەروەردە

---

[1] شعب الإيمان للبيهقي (٨١٤١).

[2] الترمذي گێراویەتییەوە (١٩٥١)، ئەلبانی لە "السلسلة الضعية ١٨٨٧" بــە "لاواز"ی داناوە.

[3] الترمذي گێراویەتییەوە (١٩٥٢)، ئەلبانی لە "السلسلة الضعية ١١٢١" بــە "لاواز"ی داناوە.

دەکرد، بەڵام ئەمڕۆ منداڵەکانمان پەروەردە دەکەین لە کاتێکدا دەرگا و پەنجەرەی ماڵەکانمان بەرامبەر جیهان لەسەر پشتن. بێگومان ئەمەیش لایەنی باشە و خراپەی هەیە، بەڵام ئەگەر بەباشی ئاگادار نەبین و تێنەگەین لەوەی ڕوودەدا، ئەوکات لایەنی خراپە بەسەر لایەنی باشەدا زاڵ دەبێت. گەر بتوانین بایەخ بە گۆڕانکارییە خێراییەکانی دەوروبەرمان بدەین و بە ئاسۆی پەروەردەیی باش خوێندنەوەیان بۆ بکەین، ئەوکات دەتوانین لە ڕووە گۆڕانگارییەکان تێبگەین. بایەخدانی کەسی پەروەردەکار بەم بابەتە لە چوارچێوەی خێزاندا یارمەتیی دەدات لە چاندنی واتا ئیمانییەکان لەناو دڵی منداڵدا، هەروەها لەمیانەی هەڵبژاردنی ئەو باخچەی ساوایان و قوتابخانانەی بایەخ بەم ڕووە دەدەن، چونکە بێئاگایی لە تێگەیشتنی ئەو شتانەی لە دەوروبەرمان ڕوودەدان دووچاری زیانێکی گەورەی ئەوتۆمان دەکاتەوە، کە هیچ ڕێگەچارەیەك نییە بۆ قەرەبووکردنەوەی.[1]

بەڵام بە کارکردنی پەروەردەیی بێوچان و ئارامگریی بەردەوام باشترین دەرئەنجام - بە پشتیوانیی خوا - بەدەستدەهێنین، چونکە تەنیا ئاراستەکردنێکی خێرا و بەپەلە لە پەروەردەکردن بەس نییە، بەڵکو پێویستی بە بەدواداچوونی بەردەوام هەیە.[2]

## پەروەردەی ئیمانی پێویستە:

ئەمڕۆ منداڵ لەناو گۆڕانکارییەکی کتوپڕی دەروونی و ڕۆشنبیری و

---

[1] بروانە ( القواعد العشر: أهم القواعد في تربية الأبناء) د. عبدالكريم بكار، (لا ١٧).
[2] سەیری (ثقافة المربي، وضاح بن هادي) بكە، (لا ٥٤).

کرانەوەیــەکی فراوانــدا دەژی، ئــەو شــتە سەرنجڕاکێشــانەی لــە هــەموو ڕوویەکەوە دەوریان داوە، ترسناکترن لەوەی گاڵتەیان پێ بکەین، ئێمــەیش بە قورسترین کار لە مێژووی مرۆڤایەتیدا هەڵدەستین، کە پەروەردەیــە.[1]
لێرەدا گرنگیــی پــەروەردەی ئیمــانی لــە لای منــداڵ و پێویســتیی زۆری ئوممەت بەم کارە دەردەکەوێت، بایەخدان بە فێرکردنی خەڵك بــە ئیمــان و بانگەوازی بۆی - بەتایبەت لای منداڵان - پێڕەوی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لەسەر بێت) و پیاوچاکانە. لێرەدا خوای گەورە لــەبارەی نووحــەوە (سەلامی خوای لەسەر بێت)، کە بانگی کوڕەکەی دەکــات و هۆشــداریی پــێ دەدات لــە هاوڕێیــەتیی کەســانی گــومڕا، دەفــەرموێت: ﴿ يَٰبُنَيَّ ٱرۡكَب مَّعَنَا وَلَا تَكُن مَّعَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾ هود: ٤٢

هەروەها خوای گەورە لە بارەی ئیبراهیمەوە (ســەلامی خــوای لەســەر بێت) کاتێ وەسییەت بۆ کوڕەکــانی دەکــات، دەفــەرموێت: ﴿ وَوَصَّىٰ بِهَآ إِبۡرَٰهِـۧمُ بَنِيهِ وَيَعۡقُوبُ يَٰبَنِيَّ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰ لَكُمُ ٱلدِّينَ فَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴾ البقرة: ١٣٢

واتە: "جا ئیبراهیم و یەعقوب ئەم وەسییەتەیان کــرد بــۆ کوڕەکــان و نەوەکانیان، وتیان: ڕۆڵەکانم! بەڕاستی خوا هــەر ئــەم ئایینــەی بــۆ ئێــوە بڕیارداوە و هەڵیبژاردووە، ئیتر ئێوەیش هەوڵ بدەن بە موسوڵمانی نــەبێت مەمرن". یەکەم وەسییەتی لوقمان بــۆ کوڕەکــەی لــەبارەی هۆشــداریدان لەسەر هاوەڵــدانان ئەوەیــە، کــە دەفــەرموێت: ﴿ وَإِذۡ قَالَ لُقۡمَٰنُ لِٱبۡنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ يَٰبُنَيَّ لَا تُشۡرِكۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّ ٱلشِّرۡكَ لَظُلۡمٌ عَظِيمٞ ﴾ لقمان: ١٣

---

[1] بڕوانە (الدعوة مهارات وفنون، شحاتة صقر)، (لا ٢٤١).

واتە: "جا لوقمان لە کاتێکدا، کە ئامۆژگاریی کوڕەکەی خۆی دەکرد، پێی وت: کوڕە شیرینەکەم! نەکەیت شتێك، یان کەسێك بە هاوتا و هاوەڵی خوا بڕیاربدەیت، چونکە بەڕاستی هاوتاو هاوەڵ بڕیاردان ستەمێکی زۆر گەورە و ناڕەوایە".

ئەمەیش پێغەمبەرمانە ﷺ ئامۆژگاری (ابن عباس) رضي الله عنه دەکات و دەفەرموێت: (**يا غلام احفظ الله يحفظك، احفظ الله تجده تجاهك، إذا سألت فسأل الله، واستعنت فاستعن بالله**).[1] ئەم فەرموودەیە پێداگیری و سووربوونی لەسەر پەروەردەی ئیمانی تێدایە.[2]

ئەوەی گرنگیی پەروەردە دەردەخات: **ئەوەیە بزانین فێرکردنی ئیمان سەری هەموو زانست و بنەماکانییەتی**، گەر منداڵ فێری ئیمان بوو، بەگوێرەی پێڕەوی پێغەمبەر ﷺ ئیمانی لە دڵ چێنرا، ئەوکات سەرجەم پەرستشەکان و لقەکانی تری ئایینی بە دوادا دێن" بۆیە گرنگیدان بەم لایەنە - بە پشتیوانیی خوا - هۆکاری سەرکەوتن و هیدایەتە، چونکە هەموو کار و کردەوەکان بەستراونەتەوە بە باوەڕبوون بە خوا و ڕۆژی دواییەوە، هەر کاتێکیش باوەڕ بە بەهێزییەوە بوونی هەبوو، ئەوکات مرۆڤ لە کاری خراپ دەگێڕێتەوە.

هەر لەو شتانەی گرنگیی ئەم بابەتە دەردەخەن، **ئەوەیە کە: دەبینین بەشێك لە باوان بە بیانووی ئەوەی هێشتا بچووکن، منداڵەکانیان لە فێرکردنی کاروباری ئایین پشتگوێخستووە**، کە گەورەیش دەبن ئەوکات

---

[1] الترمذي گێڕاویەتییەوە (٢٥١٦)، ئەلبانی بە "سەحیح"ی داناوە.

[2] سەیری فەرموودەی (احفظ الله يحفظك) (دراسة عقدية/ د. محمد العلي) بکە. (لا ٦).

ناتوانن فێریان بکەن، هەرکەسێکیش منداڵەکانی لە فێرکردنی شتی بەسوود پشتگوێ بخات و هەروا بەجێی بهێڵێت، ئەوا بێگومان خراپترین کاری کردووە. زۆرترین ڕۆڵی خراپ، هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ باوانیان و پشتگوێخستنی فێرکردنی فەریزەکانی ئاین و سوننەت، بە بچووکی بە زایەیان داون، کە گەورەیش بوون سوود بە باوانیان ناگەیەنن.[1]

هەر لەو ڕووەوە: **زۆربوونی ئەو بەرنامانەی لە دەزگاکانی ڕاگەیاندن بۆ منداڵان ئامادە دەکرێن** (بە بیستراو و بینراو و خوێنراوەوە)، کە زۆربەی جار ڕەواج بە چەمك و بۆچوونی سەرلێشێواو دەدەن لە دەروونی منداڵ، بۆیە پێویستە پەروەردەی ئیمانی لەم جۆرە ڕاگەیاندنانەدا بوونی هەبێت، چونکە پەروەردەی ئیمانی بە ڕێگە شەرعییەکانی" فاکتەری پارێزەری منداڵە لە تووشبوون بە کێشەکانی تری پەروەردەیی و لە کاتی ڕوودانیشیاندا چارەسەریان دەکات. هەر ئەمەیش مافی منداڵانە لەسەر باوان، هەروەها هۆکاری بەختەوەری دونیا و رزگاربوونی ئاخیرەتە بە پشتیوانی خودای مەزن.[2] لە کۆتاییدا، **پەروەردەی ئیمانی سەقامگیری ڕۆحی و ئارامیی دەروونی بۆ منداڵ فەراهەم دەکات**، چونکە وەڵامی پرسیارە گەورەکانی ژیان دەداتەوە، کە بریتییە لە هەڵێنجان لە هیدایەتی کتێبی خوای گەورە و ڕۆشنایی وەرگرتن لە سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ، کە بە سازگاریی کانیاو و ڕوونیی مەنهەجی خوایی دەناسرێنەوە"

[1] (تحفة المودود، ابن القيم) (ص ٢٢٩).

[2] (ضرورة تعليم القعيدة للناشئة- بندر الرباح، موقع صيد الفوائد)، سەیری (مشروع الابنالمبدع، رضال المصري) بکە، (لا ٤)، هەروەها سەیری (الهدي النبوي في تربية الأولاد- دز سعيد القحطاني) بکە، (لا٦ )، سەیری (الشباب الأهداف والوسائل - د. محمد الدويش) بکە، (لا ٢٠).

لەگەڵ شارەزابوون بە پێویستییەکانی منـداڵ و هۆشـیاربوون بـە واقیعـی خۆی و واقیعی پەروەردەیی[١]، بۆ ئەوەی لە کۆتاییدا بگاتە تـەواوکاری و هاوسەنگی لە کەسایەتیی منداڵدا.

## ئامانجەکانی پەروەردەی ئیمانی:

**ئامـانجی گشـتیی پـەروەردە بریتییـە لـە هێنانـەدیی بەندایـەتیی ڕاستەقینە بۆ خودای گەورە ﷻ، ئەم ئامانجە پێویسـتی بـە هێنانـەدیی ئامانجی لاوەکیی تری زۆر هەیە، لەوانە:**

**یەکـەم:** ئامـانجی پـەروەردەی بیروبـاوەڕی دروسـت بـۆ ڕۆڵـەکانی کۆمەڵگەی موسڵمانان، ئەمەیش لەپێناو سازکردنی مرۆڤێکی ساڵح، کە لەسەر ڕێبازی هیدایەت، خوای گەورە ﷻ دەپەرستێت.

**دووەم:** پێویستە تاکی کۆمەڵگەی موسڵمان بە ڕەوشـتی جـوان خـۆی بڕازێنێتەوە، ئەویش بە دەستگرتن بە سوننەتی پێغەمبەری خـوداوە ﷺ، ئەو پێغەمبەرەی، کە خوای گـەورە شـاهێدیی بـۆ داوە: ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴾ القلم: ٤.

هەروەها کارکردن بەو فەرموودەیەی، کە دەفەرموێت: (**إنما بُعثتُ لأتمم صالح الأخلاق**)[٢].

واتە: "من بۆیە ڕەوانە کراوم، تا ڕەوشتە جوانەکان تەواو بکەم".

---

[١] سەیری (ثقافة المربي- وضحاب ن هادي) بکە، (لا ٧).

[٢] ئیمامی ئەحمەد لە مەسنەدەکەیدا گێڕاویەتییـەوە (٨٩٣٩). ئـەلبانی بـە "سـەحیح"ی داناوە.

**سێیەم:** گەشەپێدانی خۆشەویستیی کۆمەڵ لە لای تاکی کۆمەڵگەی موسڵمانان، بە جۆرێك هەستکردن بە ئینتیمای بۆ کۆمەڵگە لە لا بچەسپێت، بایەخ بە کێشە و خەمەکانی کۆمەڵ بدات، پەیوەندیی هەبێت لەگەڵ براکانیدا، وەك پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ ﴾ الحجرات: ١٠.

واتە "بەدڵنیاییەوە باوەڕداران برای یەکترن".

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: **"باوەڕدار بۆ برای باوەڕداری وەك کۆشکێك وایە، کە بەشەکانی یەکتریان بەستووەتەوە".**[1] یان دەفەرموێت: **"نموونەی باوەڕداران لەبارەی سۆز و بەزەیی نێوانیان، وەك جەستەیەك وایە، گەر ئەندامێك ئازاری هەبێت، تەواوی جەستەکە بە شەونخوونی و نەخۆشییەوە دوعای بۆ دەکەن".**[2]

**چوارەم:** دروستکردنی تاکێکی هاوسەنگ لە ڕووی دەروونی و سۆزدارییەوە، ئەمەیش هاوکارە بۆ دروستکردنی کەسایەتییەکی چالاك و ئەندامێکی بەسوود لە کۆمەڵگەکەی، کە دەتوانێت هەڵبستێت بە ئەرکی سەرشانی لە ئاوەدانکردنەوەی زەوی و وەبەرهێنان لە خێروبێریدا" هەروەها هەڵسان بە ئەرکی جێنشینی لە سەرزەویدا، کە خودای موتەعال کردوویەتی بە جێنیشی خۆی.[3]

لێرەدا، گرنگیی پێوستبوون بە پەروەردەی ئیمانی - بە تێگەیشتنە

[1] بوخاری گێڕاویەتییەوە (٦٠٢٦).

[2] بوخاری گێڕاویەتییەوە (٦٠١١).

[3] سەیری (أهداف التربية الإسلامية ومقاصدها - محمد علي جابر، شبة الألوكة) بکە، مێژووی بلاوکردنەوەی ١٤٢٧/١١/١٦ هـ.

ڕاستەکەی - دەردەکەوێت، کە بێوچان کار دەکات لەسەر بەرهــەمهێنانی هێزی ڕۆحی و گەشەپێدانی خودپاڵنەری و بڵاوکردنەوەی گیانی تەبایی لە قسە و کــرداردا" لــە دوای ئەمانــە ئینجــا لەســەر مــرۆڤ ئاســان دەبێــت هەڵبسستێت بە ئەنجامدانی ئەو ئەرکانەی لەسەر شانییەتی لە هێنانەدیی ئامانجەکانی پەروەردەی دەروونی و جووڵەیی.[١]

## بنەما پەروەردەییەکان:

**کۆمەڵــە بنەمایــەك هــەن، کــە بنیــادی پــەروەردەیی پشــتیان پــێ دەبەستێت، دەکرێت لە دوو بنەمادا کۆیان بکەینەوە:**

**یەکەم: بنەمای زانیاری.**

**دووەم: بنەمای زانستی.**

بنەمای زانیاری: دەکرێت دابەشی سەر دوو بــەش بکرێــت: ئــەوانیش: (زانست و باوەڕ).

**بەشی یەکەم/ زانست:** بــە کلیلــی گــەورەی تێگەیشــتن و بنیادنــانی پاڵنەرە ڕەفتارییەکان دادەنرێت، وەك ئەوەی خــوای گــەورە دەفــەرموێت: ﴿ قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُولُوا الْأَلْبَابِ ﴾ الزمر: ٩

واتە: " ئایا ئەو کەسانەی، کە دەزانن و شارەزان، وەك ئەوانە وان، کە هیچ نازانن و شارەزاییان نییە؟! بەڕاستی تەنیا خاوەن بیر و هۆشەکان لەم جۆرە یاداوەرییانە سوود وەردەگرن و تێدەگەن".

---

[١] سەیری (نظرات في التربية الإيمانية- مجدي الهلالي) بکە، (لا ١١).

پێغەمبەری خوا ﷺ سووربووە لەسەر ئەوەی هاوەڵانی فێری زانستی بەسوود بن، فێریشی کردوون، کە پەنا بە خودا بگرن لە زانستی بێسوود. لەو دۆعایانەی، کە فێری کردوون، دەیفەرموو: **"ئەی پەروەردگارا! پەنات پێ دەگرم لە زانستێك هیچ سوودێکی نەبێت و لە دڵێك هیچ لە خودا نەترسێت".**[1]

**بەشی دووەم/ باوەڕ:** بریتییە لەو شتەی لە دڵی ڕۆڵەکاندا جێگیر دەبێت لە باوەڕبوون بە شەش پایەکان، کە بە واتایەکی گشتی هەموو ژیان و دوای ژیانیش دەگرێتەوە. پێغەمبەری خوا ﷺ سووربووە لەسەر چاندنی بیروباوەڕێکی ئیمانیی بە هێز و دروست لە دڵی ڕۆڵەکانی ئۆممەتەکەیدا.

سەبارەت بە بنەمای زانستی: دەکرێت ئەویش بۆ سێ بەش دابەش بکرێت: (**بەندایەتی، ڕاهێنان و ڕەوشت**).

**بەشی یەکەم/ بەندایەتی**[2]: پەروەردەی بەرهەمهێن لە هەناوێکی ڕاستگۆ و تایبەتەوە دێتەدەرێ، دەتوانێت ڕۆڵەیەك بنیاد بنێت، کە بە دڵسۆزی و دڵوابەستە بە خوای گەورە ڕووبەڕووی ژیان ببێتەوە، ڕەفتار و فیکری ڕاستەڕێ دەبێت، تەنانەت ئومێد و ئارەزووەکانیشی ڕاستەڕێ دەبن" ئەوەتا پێغەمبەری خوا ﷺ بە مەعاز (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: (سوێند بە خوا، من تۆم خۆش دەوێت، لە دوای هەموو نوێژێك ئەم زیکرە بکە: **اللهمّ أعنّي على ذكرِكَ وشُكرِكَ وَحُسنِ**

---

[1] موسلیم گێڕاویەتییەوە (٢٧٢٢).

[2] بۆ زانینی شوێنەواری خراپی ئامادەیی چەمکی بەندایەتیکردن لە جۆرەکانی پەروەردەی نوێ، سەیری (فلسفة التربية الإسلامية - د. ماجد الكيلاني) بکە، (لا ٩٥).

**عبادَتِك).**[1] فێری ده‌كات، كه‌ به‌ندایه‌تیكردن به‌خششێكی په‌روه‌ردگاره‌، به‌ته‌نیا كۆششی خودی مرۆڤ نییه‌، به‌ڵكو پشتیوانیی خودای موته‌عالیشه‌" هه‌روه‌ك فێری ده‌كات، كه‌ به‌ندایه‌تیكردن به‌رده‌وام پێویستی به‌ داوای پشتیوانیی خوای گه‌وره‌ هه‌یه‌، له‌ دڵی ده‌چه‌سپێنێت پێویسته‌ بڕوادار كاتێك خوای گه‌وره‌ ده‌په‌رستێت، بۆ ئه‌و په‌رستنه‌ داوای هاوكاری و پشتیوانیی لێ بكات و پشتی پێ ببه‌ستێت، چونكه‌ ئه‌وه‌ هه‌ر خوای گه‌وره‌یه‌ ﷻ مرۆڤ بۆ به‌ندایه‌تیكردن سه‌ركه‌وتوو ده‌كات.

**به‌شی دووه‌م/ ڕاهێنان:** زانست به‌بێ بوونی كردار هیچ بوونی نابێت، هه‌ر كرده‌وه‌یشه‌ ئامرازی جیاكاریی نێوان مرۆڤه‌كانه‌ له‌ ڕۆژی دواییدا: ﴿ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ۝٧ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ﴾ الزلزلة: ٧ - ٨ .

واته‌: "ئه‌وه‌ی به‌قه‌ده‌ر سه‌نگی گه‌ردیله‌یه‌ك خێر و چاكه‌ی ئه‌نجام دابێت، ده‌یبینێته‌وه‌، ئه‌وه‌یشی به‌قه‌ده‌ر سه‌نگی گه‌ردیله‌یه‌ك شه‌ڕ و خراپه‌ی هه‌بێت، ده‌گاته‌وه‌ ده‌ستی".

**به‌شی سێیه‌م/ ڕه‌وشت:** پێڕه‌وی ئیسلام مرۆڤی خاوه‌ن ڕه‌وشت دروست ده‌كات، ته‌نانه‌ت پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ وای ده‌بینێت، كه‌ هه‌موو په‌یامه‌كه‌ی له‌ یه‌ك واتا خۆی كۆده‌كاته‌وه‌ ئه‌ویش (ڕه‌وشتبه‌رزی و په‌روه‌رده‌كردنه‌ له‌سه‌ری)، ئه‌وه‌تا ده‌فه‌رموێت: (**من بۆیه‌ ڕه‌وانه‌ كراوم، تا ڕه‌وشته‌ جوانه‌كان ته‌واو بكه‌م".**[2] بۆ ڕه‌وشتبه‌رزییش هانیان ده‌دات و

---

[1] ئه‌بو داود گێڕاویه‌تییه‌وه‌ (١٥٢٢)، ئه‌لبانی به‌ "سه‌حیح"ی داناوه‌.

[2] ئه‌حمه‌د گێڕاویه‌تییه‌وه‌ (٨٩٣٩)، ئه‌لبانی به‌ "سه‌حیح"ی داناوه‌ له‌ (صحيح الجامع ٢٣٤٩).

دەفەرموێت: (**خۆشەویستترین کەستان لای من و نزیکترین کەستان لە منەوە لە ڕۆژی دواییدا، ڕەوشتبەرزترینتانە**".[1] بۆیە ڕەوشتی جوان بەرهەمی پەروەردەی ئیمانییە.[2]

## نموونە پەروەردەییەکان:

نموونەهێنانەوەی کرداری لە باشترین ئەو ڕێگەیانەن، کە بنەما و بەهاکان لە مێشکدا دەچەسپێنن، لێرەدا کۆمەڵێك نموونە بە پوختەکراوی دەخەینەڕوو، کە ڕێنوێنیی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵان لە بنیادنانی ئیمانی لە لای منداڵ ڕوون دەکەنەوە[3]:

١- (ابن عباس) ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ حەسەن و حوسەینی فێر دەکرد، کە پەنا بە خوا بگرن، دەیفەرموو: (باوکتان ئیسماعیل و ئیسحاقی فێری پەناگرتن دەکرد بە خودا و دەیفەرموو: **أعوذ بكلمات الله التامة من كل شيطان وهامة ومن كل عين لامة**).[4]

٢- (ابو هريرة) ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ

---

[1] الترمذي گێڕاویەتییەوە (٢٠١٨).

[2] (خمسة أسس إيمانية في تربية الأبناء - د. خالد روشه)، ماڵپەری المسلیم، مێژووی بڵاوکردنەوە ١٤٣٢/١/٩ هـ. سەیری (منهج التربية النبوية للطفل - محمد سويد) بکە، (لا ٢٥٠، ٢٨٤، ٢٥٢). هەورەها سەیری (النبي المربي، د. أحمد الأسمر) بکە، (لا ١٠٦، ٢٤٩، ٣٠٥).

[3] سەیری (ضرورة تعليم العقيدة للناشئة، بندر الرباح) بکە لە ماڵپەری الفوائد. هەروەها سەیری (تربية الأولاد في الإسلام-عبدالله علوان) بکە، (١٥١/١).

[4] بوخاری گێڕاویەتییەوە (٣٣٧١).

دەفەرموێت (**ما من مولود إلا يولد على الفطرة، فأبواه يهودانه أو ينصرانه أو يمجسانه**).[1]

واتە: "هیچ منداڵێك لەدایك نابێت، مەگەر لەسەر فیترەتی پاك، پاشان ئەوە دایك و باوکیانن، کە دەیانکەن بە یەهوودی، یان بە مەسیحی و مەجووسی".

٣- (عمر)ی کوڕی (ابو سلمة) ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: من مێردمنداڵێك بووم لە ماڵەکەی پێغەمبەری خوادا ﷺ، دەستەکانم لەناو خواردن وەردەدا، تا پێغەمبەری خوا پێی فەرمووم: (**يا غلام، سمّ الله، وكل بيمنك وكل مما يليك**).[2]

واتە: "ئەی لاو، ناوی خوا بهێنە، بە دەستی ڕاست بخۆ، تەنیا لە بەردەمی خۆتەوە بخۆ".

٤- (ابن عباس) ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ڕۆژێکیان من لە پشتکەی پێغەمبەری خواوە ﷺ سواری ولاخ بووبووم، فەرمووی: "**يا غلام إني أُعلمك كلمات، احفظ الله يحفظك، احفظ الله تجده تجاهك، إذا سألت فاسأله الله، وإذا استعنت فاستعن بالله، واعلم أن الأمة لو اجتمعت على أن ينفعوك بشيء لم ينفعوك إلا بشيء قد كتبه الله لك**).[3]

واتە: "ئەی لاو! من چەند وشەیەکت فێر دەکەم، ئایین و سنوورەکانی

---

[1] بوخاری گێڕاویەتییەوە (١٣٥٨).
[2] بوخاری (١٣٥٨) و موسلیم (٢٠٢٢) گێڕاویەتیانەوە.
[3] الترمذي گێڕاویەتییەوە (٢٥١٦).

خوا بپارێزە، دەتپارێزێت" ئاین و سنوورەکانی خوا بپارێزە، لە کاتی پێویستیدا خوا لە بەرامبەرتدا دەبینیت. ئەگەر پاڕایتەوە، لە خوا بپاڕێتەوە. ئەگەر داوای پشتیوانیت کرد، لە خوا داوا بکە. بیشزانە ئەگەر هەموو خەڵك کۆببنەوە بۆ ئەوەی سوودێکت پێ بگەیەنن، هیچ سوودت پێ ناگەیەنن، مەگەر خوا بۆتی نووسیبێت، ئەگەر هەموو خەڵکیش کۆببنەوە بۆ ئەوەی زیانێکت پێ بگەیەنن، هیچ زیانت پێ ناگەیەنن، مەگەر ئەوەی خوا بۆتی نووسیبێت.

٥- (ابن عباس) ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ چەند وشەیەکی فێرکردم لە قنوونی نوێژی ویتردا بیاخوێنم: (**اللهم اهدني فمن هديت، وعافني فيمن عافيت، تولَني فيمن تولّيت، وبارك لي فميا أعطيتَ، وقِني شرّ ما قضيت، إنك تقضي ولا يُقضى عليك، إنه لا يذلّ من واليت، تباركت ربنا وتعاليت**).[١]

٦- (انس)ی کوڕی (مالك) ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: (**يا بنيّ، إذا دخلتَ على أهلك، فسلّم، يكون بركة عليك وعلى أهل بيتك**).[٢]

واتە: "کوڕەکەم! گەر چوویتە لای کەسوکارت، سەلام بکە، چونکە دەبێتە بەرەکەت لەسەر تۆ و کەسوکارت".

٧- (جندب البجلي) ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووین، لە کاتێکدا کۆمەڵە گەنجێکی بەهێز و خزمەتکار

---

[١] ابو داود گێڕاویەتییەوە (١٤٢٥)، ئەلبانی بە "سەحیح"ی داناوە.
[٢] الترمذي گێڕاویەتییەوە (٢٦٩٨)، ئەلبانی بە "حەسەن"ی داناوە.

بووین، پێش ئەوەی فێری قورئان ببین فێری ئیمان بووین، دواتر فێری قورئان بووین و ئیمانمان پێی زیاد بوو.[١]

٨- ئوم سولەیمی دایکی ئەنەس ﷺ موسڵمان بوو، لە کاتێکدا ئەنەس ساوا بوو و هێشتا لە شیرخواردن نەبڕابووەوە، بەردەوام ئەنەسی تەلْقین دەدا و پێی دەیوت: بڵێ: (لا إله إلا الله، وبلّى: أشهد أن محمداً رسولُ الله)، ئەویش دەیوتەوە.[٢]

٩- (ابراهیم التمیمي) ﷺ دەڵێت: خەڵك پێیان خۆش بوو یەکەم وشەیەك، کە منداڵ فێری دەبێت: (لا إله إلا الله) بوایە - حەوت جاران ، ئەویش یەکەم وشە دەبوو، کە قسەی پێ دەکرد.[٣]

## پەروەردەی ئیمانی لای منداڵ:

**گرنگترین بابەتی پەروەردەیی لە ڕووی ناوەڕۆکە پەروەردەی ئیمانییە لای منداڵ،** چونکە کار دەکات لەسەر دروستکردنی دابونەریتی جوان و چەسپاندنی عەقیدەی دروست لە قووڵایی بیر و دڵی منداڵ و باشترکردنی" هەروەها ئاراستەکردنی بەرەو ڕەوشتەبەرزی و چالاککردنی لە هەموو ڕەفتارەکانیدا.[٤] لەم قۆناغەی تەمەنیدا منداڵ دیدگای بەرامبەر دونیا دروست دەکات، هەر لەمیانەی ئەمەیشدا ڕەفتار و ڕەوشت و مامەڵەکانی بنیاد دەنێت، بەگوێرەی جێبەجێکردنی ئەم پەروەدەیە

---

[١] ابن ماجة گێڕاویەتییەوە (٦١)، ئەلبانی بە "سەحیح"ی داناوە.
[٢] سیر أعلام النبلاء (٣٠٥/٢).
[٣] مصنف عبدالرزاق (٧٩٧٧).
[٤] منهج الإسلام في تربية عقدة الناشئ، محمد خیر فاطمة. (ص ٢٠١).

بەختەوەریی دونیا و سەرکەوتنی ئاخیرەت بەدەست دەهێنێت. لەبیرمان نەچێت ئەم کارەیش ئەرکی دایکان و باوکانە، قورئانی پیرۆز ئاماژەی بەمە داوە، کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِيٓ أَوۡلَٰدِكُمۡ ﴾ النساء: ١١.

تەنانەت پێغەمبەری خوا ﷺ بە ڕوون و ئاشکرا لەم بارەیەوە دەفەرموێت: (**هیچ منداڵێك لەدایك نابێت، مەگەر لەسەر فیترەتی پاك، پاشان ئەوە دایك و باوکیانن ،کە دەیانکەن بە یەهوودی، یان بە مەسیحی و مەجووسی**).[1]

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر چەند خاڵێك لەوانە:

١. ئیمان خۆڕسکە لە مرۆڤدا، هەرکەسێك لێی لابدات، ئەوە بەهۆی خراپی و گەندەڵیی خۆیەوەیە.

٢. ئەم فەرموودەیە بەرپرسیارێتی دایکان و باوکان و ڕۆڵی گەورەیان لە پەروەردەدا دەردەخات.

٣. ئاماژە بە کارتێکردنی ژینگە لەسەر پەروەردە دەکات.[2]

لە بەخششەکانی خوای گەورە ئەوەیە، کە دڵی مرۆڤی لە سەرەتاکانی تەمەنیدا بە ئیمان خۆش کردووە، بەبێ پێویستبوون بە هیچ بەڵگە و سەلماندنێك.[3] لێرەدا ڕۆڵی باوان ئەوەیە بە باشترین شێوە پارێزگاریی لێ بکەن و ئەم فیترەتە بە پاکی ڕابگرن. هەروەها ڕۆڵەکانیان

---

[1] بوخاری گێڕاویەتییەوە (١٣٥٩).

[2] تطور الشعور الدين لدى الأطفال والمراهقين. أ.د.محمد الخطيب (ص ٤).

[3] إحياء علوم الدين، الغزالي (٩٤/١).

لەسەر ئایینی دروستی هەڵچنراو لەسەر دەقەکانی قورئان و سوننەت پەروەردە بکەن، پێویستە لەسەریان ئەم بابەتە نەسپێرن بە پەروەردەی ژینگە، کە چەمکەکانی لە دەوروبەری خۆی وەردەگرێت، چونکە ئیسلامی تەقلیدی لەم سەردەمی کرانەوەیەی ئێستا و نزیکبوونەوەی جیهان لە یەکتری ناتوانێت منداڵ لە چەوترەوی بپارێزێت.

دڵی منداڵ گەوهەرێکی خاڵییە لە هەر نەخش و وێنەیەك، ئامادەیی هەر جۆرە نەخشێکی تێدایە، گەر لەسەر خێر ڕاهات و فێری بوو و لەسەری گەورە بوو، بەختەوەری دونیا و دوارۆژ دەبێت" دایك و باوکیشی لە خێر و چاکەکەیدا بەشدار دەبن، تەنانەت پەروەردەکار و مامۆستاکانیشی بەشدارن، بەڵام گەر لەسەر خراپە ڕاهات و وەك ئاژەڵ پشتگوێ خرا، بە هیلاك دەچێت" ئەوکات بارگرانی دەکەوێتە سەر خۆی و کەسوکاری[1]، چونکە باشترین پەروەردە ئەوەیە لە بچووکیدا بێت، گەر نەکرا و منداڵ پشتگوێ خرا ئەوکات ڕاستکردنەوەی ئەستەم دەبێت.[2]

ئەو منداڵەی لە خێزانێکی باوەڕ بەهێز و پابەند بە ڕێنماییەکانی ئیسلامی ڕاستەقینەدا گەورە دەبێت، لە هەموو شتێك لاسایی باوانی دەکاتەوە، تێگەیشتنی تایبەتی خۆی لە ڕوانگەی ڕوانینی باوانی دروست دەبێت، لە بەرامبەردا کاتێ منداڵ گەورە دەبێت و دەبینێت دایك و باوکی پابەند نین بە ڕێنمایی شەرعییەکان، ئەوکات زۆر ئەستەم دەبێت ڕوو بکاتە ئایین، چونکە کاتێ تەمەنی بچووك بوو هیچ شوێنەوارێکی ئایینی نەبینی، بۆیە هیچ ڕەنگدانەوەیەکی ئایینی تێدا بەدی ناکرێت.[3]

---

[1] إحياء علوم الدين، الغزالي (٣/٧٢).

[2] سەیری (الطب الروحاني - ان الجوزي) بکە، (لا ٦٠).

[3] سەیری "المربون و تساؤلات الأطفال، نوال الخليفة" بکە، (لا ٢٠ - ٣٠).

## گەشەی ئایینی لە لای منداڵ:

ئایین لە لای منداڵ لە بیرۆکەیەکەوە دەست پێ دەکات، ئەویش بیرۆکەی بوونی خودایە، پاشان سەردەگرێت بۆ بیرۆکەی تری وەك دروستبوون و ڕۆژی دوایی و فریشتەکان و شەیتانەکان و... هتد. ڕووکارەکانی گەشەی ئایینی لای منداڵ بە چوار تایبەتمەندی دەناسرێنەوە:

أ- **واقیعییەت:** منداڵ تێگەیشتنی ئایینی بە واقیعێکی بەرجەستەکراو دەبەستێتەوە، تا ئەو کاتەی دەبێتە هەرزەکار و حەقیقەتەکان دەزانێت و تێگەیشتنەکەی لەو شتە بەرجەستەکراوانە دادەماڵێت.

ب- **ڕووکەش:** منداڵ لە عیبادەتەکاندا لاسایی گەورەکان دەکاتەوە بە ڕووکەشی، بێ ئەوەی لە واتا ڕۆحییەکەی تێبگات، بۆیە باشترە کەسی پەروەردەکار سوود لە مەیل و ئارەزووی منداڵ لەم ڕووەوە ببینێت و لەسەر ڕەوشت و پایەکانی ئیسلام ڕایبهێنێت.

ج- **خۆسوودی:** منداڵ هەست دەکات دایك و باوك و مامۆستاکەی بە بینی ئەنجامدانی چەند عیبادەتێك دڵخۆش دەبن، بۆیە لەپێناو بە دەستهێنانی خۆشەویستییان ئەم کارە دەکات" هەروەها دەیکاتە ئامرازێك بۆ هێنانەدیی هەندێ لە حەزوو و ئارەزووەکانی، یان بۆ دەربازبوون لە هەندێ سزا.

د- **دەمارگیری:** منداڵ هەندێ جار بۆ ئایینەکەی دەرمارگیر دەبێت بە دەرماگیرییەکی سۆزداری، بەرگری لەو غەریزە خۆڕسکەی خۆی دەکات،

تا دەبێتە ئینتیما و خۆشویستن، وێنەی پابەندبوونی بە خۆشەویستیی خوا بەرزدەکاتەوە.[1]

لەمەوە هەست بە گرنگیی پەروەردەی ئیمانی دەکەین، پێویستیشە لەسەر باوان و پەروەردەکاران بەجددی کار بکەن بۆ نزیککردنەوەی ئیمان لای منداڵان، بەتایبەت لەم سەردەمەی ئێستامان، کە پڕاوپڕە لە فیتنە و ئاشووب و خراپەکاری.

لە گرنگترین ئەو کارانەی پێویستە باوان بیانکەن:

**یەکەم:** زیرەککردنی فتیرەت لە دەروونی منداڵ، ئەویش لە فێرکردنی منداڵ لە وشەی یەکتاپەرستیدا خۆی دەبینێتەوە.

**دووەم:** بە فێرکردنی شەش پایەکەی ئیمان، پاڵپشتیی ئیمانەکەی بکرێت، ئەم کارەیش دەبێتە هۆی چەسپاندنی خۆشەویستیی خودا ﷻ و خۆشەویستیی پێغەمبەرەکەی ﷺ و فێربوونی قورئان.[2]

بوونی فیترەتی ئایینی لەناو دڵی منداڵ، لە ئەرکی پەروەردەکردندا یارمەتیی دایکان و باوکان دەدات. ئەم فیترەتە ئاماژە بە بەبوونی غەریزەی دینداری دەکات، ئەم غەریزەیە وەك غەریزەکانی تر قەبوڵی گۆڕین و ئالوگۆڕی ناکات، بەڵکو تەنیا قەبوڵی پێشخستن و ئاراستەکردن دەکات. لەوانەیە ئەم فیترەتە بە جۆرێك بەکاربهێنرێت جیا لەو ئامانجەی

---

[1] سەیری "تربية الطفل في الإسلام - سيما أبو رموز) بکە، (لا ٤٨)، هەروەها سەیری (دور الأنشطة غير الصفية في تنمية حب النبي ﷺ لدى تلميذات المرحلة الإبتدائية - فوزية البقمي) بکە، (لا ٧).

[2] سەیری "تطور الشعور الديني لدى الأطفال والمراهقين. أ. د. محمد الخطيب) بکە، (لا ٦).

بۆی دروستکراوە، بەڵام ئیسلام داوا دەکات ئەم فیترەتە بۆ ئەو ئامانجە ئاراستە بکرێت، کە لەپێناوی دروست بووە.[1]

یەکێك لەو کارانەی پێویستە منداڵی موسڵمان لەسەری گەورە بکرێت، شەش پایەکانی ئیمانە، لە هەمویشیان گرنگتر باوەڕبوونە بە خودا، چونکە لە دوای بە دەستهێنانی باوەڕبوون بە خودا" پایەکانی تر بەرهەمیان دەبێت. خوای گەورە خۆشەویستییەکەی کردووەتەوە تۆندتۆڵترین ڕێکخەرەکانی ئیمان و ملکەچبوونی بۆی، بە واتایەکی تر خۆشەویستییەکەی بۆ بەندایەتیکردنی ئەرکە و دژایەتیکردنیشی بۆ دوژمنانی، پێویستە ئەم خۆشەویستییەیش لە سەرووی هەموو خۆشەویستییەکانی دونیاوە بێت: ﴿ قُلْ إِن كَانَ ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ وَإِخْوَٰنُكُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَٰلٌ ٱقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَـٰرَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَـٰكِنُ تَرْضَوْنَهَآ أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَجِهَادٍ فِى سَبِيلِهِۦ فَتَرَبَّصُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَـٰسِقِينَ ﴾ التوبة: ٢٤

واتە: "(ئەی پێغەمبەر!) پێیان بڵێ: ئەگەر باوباپیرتان و ڕۆڵە و نەوەکانتان و براکانتان و هاوسەرانتان و عەشرەت و هۆزتان و ماڵ و سامانێك، کە بەدەستتان هێناوە، یاخود بازرگانییەك، کە دەترسن شکان و بێ بازاڕی ڕووی تێ بکات و خانووبەرە و کۆشك و تەلارێك، کە حەز دەکەن لێتان تێك نەچێت و دڵخۆشن پێی" لاتان خۆشەویستتر و نازدارتر بێت لە خوا و پێغەمبەرەکەی و جیهاد و تێکۆشان لەپێناو ڕێبازی ئەو زاتەدا، دە ئەوە چاوەڕوان بن، هەتا خوا دێت بە فەرمانەکانییەوە، خوای

---

[1] سەیری "الطريق إلى العبقرية، مقداد بالجن"، بکە، (لا ٣٩)، سەیری (تطور الشعور الديني لدى الأطفال والمراهقين، أ. د. محمد الخطيب) بکە، (لا ٤).

پەروەردگاریش هیدایەت و ڕێنموویی قەومی یاخی و لە سنووردەرچوو نادات".

خوای پەروەردگار ئەمەی کردووەتە یەکەم سیفەت بۆ ئەو کەسانەی لێی ڕازین، وەك دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَن يَرۡتَدَّ مِنكُمۡ عَن دِينِهِۦ فَسَوۡفَ يَأۡتِي ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ يُحِبُّهُمۡ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ يُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوۡمَةَ لَآئِمٖۚ ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴾ المائدة: ٥٤

واتە: "ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! هەرکەس لە ئێوە لە ئایین و بەرنامەکەی وەرگەڕێت و پاشگەز ببێتەوە، ئەوە لە ئاییندەدا خوا کەسانێك دەهێنێتە کایەوە، کە پەروەردگاری مەزن خۆشی دەوێن، ئەوانیش ئەویان خۆش دەوێت" هەروەها ملکەچ و فەرمانبەردار و بەسۆزن بۆ ئیمانداران و سەربڵند و نەبەز و دەروونبەرزن بەسەر بێباوەڕاندا، لەپێناو ڕێبازی خوادا و بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی ئەو هەوڵ دەدەن و خەبات دەکەن و تێدەکۆشن، لە لۆمەی لۆمەکارانیش ناترسن، ئەوە فەزڵ و ڕێزی تایبەتی خوایە، کە دەیبەخشێت بە هەرکەس بیەوێت" خوایش فراوانگیر و زانایە".

ڕوونی کردووەتەوە، کە یەکتاپەرستیی پاڵفتە نایەتەدی، مەگەر بە خۆشەویستیی بێسنووری خودای موتەعال، وەك دەفەرموێت: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادٗا يُحِبُّونَهُمۡ كَحُبِّ ٱللَّهِۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَشَدُّ حُبّٗا لِّلَّهِۗ وَلَوۡ يَرَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ إِذۡ يَرَوۡنَ ٱلۡعَذَابَ أَنَّ ٱلۡقُوَّةَ لِلَّهِ جَمِيعٗا وَأَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعَذَابِ (١٦٥) ﴾ البقرة: ١٦٥

واتە: "هەندێ کەس هەن لەجیاتی ئەوەی خواپەرست بن، شتانی تر دادەتاشین بۆ خۆیان و خۆشەویستی و سۆز دەدەن بەو بت و بەرنامۆلکە و تولەڕێیانە و خۆشیان دەوێن، وەك چۆن ئیمانداران خوایان خۆش دەوێت، بەڵام ئەوانەی ئیمان و باوەڕیان هێناوە لەرادەبەدەر خوایان خۆش دەوێت (هەر بەراورد ناکرێت).. جا ئەوانەی ستەمیان کردووە، ئەگەر دەیانزانی لە کاتێکدا بە چاوی خۆیان ڕووبەڕووی ئەو سزایە دەبنەوە، کە بەڕاستی بۆیان دەردەکەوێت، کە هێز و توانا و دەسەڵات هەر هەمووی بەدەست خوایە و دڵنیادەبوون لەوەی ئەو خوایە سزاکەی زۆر بەئازارە (بۆ ستەمکاران)".

لە بەرزترین پایەکانی ئەو بەندایەتییەی، کە خوای گەورە لەپێناویدا دروستی کردووین، خۆشەویستییە، تەنانەت بنچینە و ڕۆحی یەکتاپەرستی بریتییە لە خۆشەویستییەکی دڵسۆزانە بۆ خوای مەزن" ئەمەیش بنەچەی پەرستشە، بەڵکو حەقیقەتی بەندایەتییە، چونکە یەکتاپەرستی نایەتەدی، تا خۆشەویستیی بەندە بۆ خوای پەروەردگار تەواو نەبێت و پێش هەموو خۆشەویستییەکانی تر نەکەوێت" بە ئەندازەیەك سەرجەم خۆشەویستییەکانی تر دەبنە پاشکۆیی ئەم خۆشەویستییە، کە سەرفرازی و بەختەوەریی بەندەی تێدایە.[١]

ئەم جۆرە خۆشەویستییە بنیادنراوە لەسەر ئیمان، لە گەورەترین هۆکارەکانی بەهێزکردنی ڕەفتاری منداڵ و جێگیرکردنیەتی لەسەر ئایینی ئیسلام و ملکەچکردنی بۆ خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی ﷺ.

---

[١] القول السديد شرح كتاب التوحيد، عبدالرحمن السعدي. (ص ١٢٨).

هەرکەسێك خۆشەویستیی خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی ﷺ لە دڵیدا چێنرا، لە بیروباوەڕ و بەندایەتیکردن و ڕەوشتیدا ڕاستەڕێ دەبێت، گەرچی لە هەندێ شتی لاوەکییش لابدات، یان لە بیری بچێت" ئەوە خۆشەیستییەکەی نێودڵی بە پشتیوانیی خوا دەیگەڕێنێتەوە سەر ڕێگەر ڕاست[1]، چونکە بۆ ئەم جۆرە خۆشەویستییە جگە لە پاڵنەری دەرەکی، پاڵنەری ناوەکییش هەن.

ئەو دیدگایەی بیروباوەڕی ئیسلام بۆ بوونەوەر پێشکەشی دەکات، بەوە دەناسرێتەوە، کە لەگەڵ فیترەت و سروشتی مرۆڤدا گونجاوە" هەروەها لەگەڵ عەقڵی ساغدا هاوتایە و تێناگیرێن[2]، وەك چۆن بە هەندێ تایبەتمەندیی تر دەناسرێتەوە، کە لە هیچ بیروباوەڕێکی تردا بوونیان نییە، بەوپێیەی ئەو دیدگایە سیستمی فیکری و عەقیدەیی و بەهایی و تەشریعیی تێدا تەواو بووە، هەر لەو ڕوانگەیەیشەوە خوێندنەوەیەکی گشتی بۆ بنەمای گەردوون و چارەنووسی و حەقیقەتەکانی ناوەوەی دەکات" هەروەها خوێندنەوەی بۆ بنەمای ژیانی مرۆڤ هەیە، دواتر ئەو مەبەستەی گەردوون و مرۆڤ لەپێناویدا دروست بوون دیاری دەکات، هەر بۆیە وەڵامی پرسیارە وجودییەکانی مرۆڤ دەداتەوە، ئەو پرسیارانەی بە سروشتی عەقڵیانەوە دەبێت بکرێن، چونکە ئەگەر مرۆڤ وەڵامێکی تێروتەسەلی ئەمانەی دەست نەکەوێت ئاسوودە نابێت و لە سەرگەردانی و دڵەڕاوکێی بەردەوامدا دەژی" بەهۆی ئەوەی واتای ڕاستەقینەی ئەم ژیانەی نەدۆزیوەتەوە.[3]

---

[1] التربية العقائدية، محمد حاج الجزائري، ماڵپەری (في طريق الإصلاح).

[2] تربية الطفل في الإسلام، عبدالسلام الفندي، (ص ١٠١).

[3] الطريق إلى العبقرية، مقداد بالجن، (ص ٦٧ - ٦٨).

## بەروبوومی پەروەردەی ئیمانی:

کۆمەڵە بەروبوومێك هەن، کە پەروەردەکاری ئیمانی دەیانچنێتەوە، لەوانە:

**یەکەم:** دەستپێشخەری و خێراکردن لە ئەنجامدانی کاری چاك، خاوەنی ئەم جۆرە پەروەردەیە لە هەرکارێك دەگەڕێت، کە لە خوای گەورە نزیکی بکاتەوە.

**دووەم:** بەربەستی ناوەوەی مرۆڤ بەهێز دەکات، باوەڕی ڕاستەقینەی ڕەفتاری مرۆڤ ڕێك دەخات.

**سێیەم:** بەگرنگ وەرنەگرتنی دونیا، دڵی پێ نابەسترێتەوە بە جۆرێك بیکاتە تەوەری هەموو گرنگیپێدان و مامەڵەکانی.

**چوارەم:** پشتیوانیی خوایی، خوای مەزن ﷻ کاروبارەکانی بەندە باوەڕدارەکەی دەگرێتە ئەستۆ بە جۆرێك بەرژەوەندەییە ڕاستەقینەکانی دەهێنێتە دی و بەختەوەری بۆ هەردوو دونیا دەهێنێت.

**پێنجەم:** ئارەزووکردن بۆ نزیکبوونەوە لە خوا، تا باوەڕ زیاد بێت، ئەوکات بڕوابوون و ئارەزوو و خۆشەویستیی بەندە بە خوای پەروەردگاری بۆ زیاد دەبێت.

**شەشەم:** بزربوونی لایەنە نەرێنییەکان و کەمبوونی کێشە لە نێوان تاکەکان، تا باوەڕ لە دڵدا زیاد بێت، حەز و خولیای دونیا کەم دەبێت،

ئەم جۆرە باوەڕە پاڵ بە خاوەنەكەیەوە دەنێت بۆ ئەنجامدانی كاری چاك و بەرز.

**حەوتەم:** كاریگەریی ئەرێنی لەسەر خەڵكی، مرۆڤی باوەڕداری ڕاستەقینە بەردەوام هەوڵی چاكسازیی دڵی خۆی و دەوروبەری دەدات.

**هەشتەم:** هەستكردن بە ئارامی و دڵنیایی، هەر كاتێك ئەم بڕوا ئیمانییە لە دڵ جێگیربوو، ئەو ترس و دڵەڕاوكێیانەی، كە خەڵك دەترسێنن، لە لای ئەو وردوخاش دەبن.[1]

## تەوەرەكانی پەروەردەی ئیمانی:

پێویستە لەسەر باوان، هەرشتێك ئیمان لە دڵی منداڵەكانیاندا بە هێز دەكات و ڕەوشت و ڕەفتاریان جوان دەكات و باوەڕیان بە ئایینی موحەممەد ﷺ پتەو دەكات، هەرشتێك ئەم كارانە بكات دەبێت فێری منداڵەكانیانی بكەن، لەوانە:

١- فێركردنی شەش پایەكەی ئیمان، ئیمانێكی پوختەكراو بە تێكڕای شەریعەت و گونجاوی لەگەڵ فیترەت و سروشتی مرۆڤ، لەگەڵ خۆبەدوورگرتن لە شێوازی فێركردنی تەقلیدی، كە ڕۆحی ئیمان بزر دەكات. پێداگیری لەسەر ئەوە بكرێت، كە دەبێت ئەم كارە بە ڕێگەیەك بێت، دڵ بەئاگا بهێنێتەوە و مێشك بە كاربخات و ڕەفتار جوان بكات.

٢- پەروەردەكردنی منداڵ لەسەر خۆشەویستیی پێغەمبەر ﷺ و خۆشەویستیی ئالوبەیت و هاوەڵانی، بەبێ زیادەڕۆیی و ستەمكردن.

---

[1] سەیری (نظرات في التربية الإيمانية، مجدي الهلالي) بكە، (لا ١٦).

٣- پــەروەردەکردنی منـــداڵ لەســـەر بـــەرزڕاگرتنی ئـــایین و پەرستشەکانی، هۆشدارپێدانیشــی لــە بەکەمســەیرکردن و ڕقلێبوونــە و پشتگوێخستنی.[١]

٤- فێرکردنیان بەوەی ئیمان بە شێوەی تەواو نایەتــەدی، تــەنیا بــە ئەنجامدانی کردەوەی باش نەبێت، ئیمان بە ملکەچبوون زیاد دەکات و بە گوناهیش کەم دەکات. بۆیە پەروەردەی دروســتی ئیمــانی پێویســتە، تــا بەرهەمەکـــەی لـــە بوارەکـــانی ڕەوشـــت و ڕەفتـــار و خواپەرســـتیدا بهێنێتەبەر.[٢]

٥- جێگیرکردنــی بــاوەڕ بــە ڕۆژی دوایــی لــە دڵ و دەروونیـــان و بەرزڕاگرتنی ئەو ڕۆژە، هەروەها بەستنەوەی بابەتی پاداشــتوەرگرتن بــەو کردەوەی، کە مرۆڤ لە دونیادا ئەنجامی دەدات، هەرکەسێك چاکەکار بێت بەهەشتی بۆ هەیە و هەرکەسێکیش خراپەکار بێت دەبێتە ئەهلی دۆزەخ.

٦- دڵنیاکردنــەوە لەســـەر چــاودێریکردنی خــوای گــەورە لەســـەر بەندەکانی، ئەو زاتە دەیانبینێت و دەیانبیستێت، هــیچ شــتێك لای ئــەو شاراوە نییە.

٧- قووڵکردنەوەی ئەو هەستە لای منداڵ، کــە ئایینەکــەی لەســـەر حەقە، ئەمــەیش وا دەکــات بــە ســەربەرزییەوە دەســت بــە ئایینەکــەوە بگرێت.[٣]

---

[١] سەیری (منهج التربیة النبویة للطفل، محمد سوید) بکە، (لا ٢٥٣).

[٢] سەبارەت بە بابەتی خواپەرستی، دەکرێت سوود لــە کتــێبی (ملامــح الســعادة في تربیــة الطفل عل العبادة، د. عبدالمجید البیانوني) وەربگیرێت، هەروەها ســەیری (البنــاء العبــادي من کتاب منهج التربیة النبویة للطفل/ محمد سودي) بکە، (لا ٢٥٠).

[٣] سەیری (التربیة العقائدیة، د.محمد حاج الجزائري في موقع طریق الإصلاح) بکە، هــەروەها (آراء ابن الجوزي التربیة، د.لیلی عطار)، (لا ٣٢٣ - ٣٣٧).

## شێوازە پەروەردەییەکان بۆ چاندنی ئیمان:

دەکرێ ئەم شێوازانە بۆ دوو ڕێچکە دابەش بکەین، یەکەمیان پێش قۆناغی پێگەیشتن (پێش تەمەنی ٧ ساڵان)[١]، دووەمیش قۆناغی دواتر.

لەو هۆکارانەی یارمەتیی جێگیرکردنی ئیمان دەدەن لەم قۆناغەدا (واتە قۆناغی بەر لە پێگەیشتن)، ئەمانەن:

١- تێگەیاندنی منداڵ بە واتای ئەو ناوانەی بە (عبد) دەست پێ دەکەن، وەك: (عبدالرحمن) و (عبدالرحیم)، گرنگیدان پێی بۆ ئەوەی گوێبیستی بانگ بێت، فێرکردنی زیکرەکانی ڕۆژانە و نزاکردن و بەردەوامبوون لەسەری و دووبارەکردنەوەی لە لای[٢]، بیرهێنانەوەی بەخششەکانی خوای گەورە لەسەری، - بەتایبەت لەسەر نانخواردن - فێرکردنی (بسم الله) لە سەرەتا و (الحمدلله) لە کۆتاییدا.

٢- لەبەرکردنی هەندێ سورەتی قورئان لە لایەن منداڵەوە، تێگەیاندنی ئەوەی، کە قورئان فەرمایشتی خوای پەروەردگارە، یەکەم سورەتێك بۆ لەبەرکردن پێویستە سورەتی (الفاتحة، الإخلاص والمعوذتان)

---

[١] قۆناغی پێگەیشتن بە عەرەبی پێی دەگوترێت (سن التمییز)، لە منداڵێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگۆڕێت، بەڵام بەزۆری تا ساڵی حەوتەمە، پێی دەگوترێت ساڵی جیاکردنەوە، بەهۆی توانای جیاکردنەوەی منداڵ لە شتی باش و خراپ" هەروەها تێگەیشتن و هەستکردنی. زانایانی بواری پەروەردە جەخت لەوە دەکەنەوە، کە قۆناغی پێش قوتابخانە گرنگترین قۆناغە بۆ چەسپاندنی بەهاکان لای منداڵان.. سەیری کتێبی (الأسرة ودورها في تمنیة القیم الاجتماعیة لدی الطفل في مرحة الطفولة المتأخرة، الحسین عزي) بکە، (لا ١٧).

[٢] دەکرێت سوود لە کتێبی (حصن المسلم – سعید القحطاني) وەربگیرێت، هەروها کتێبی (أذکار الطفل المسلم)ی محمود المصري.

بێت" هەروەها دەکرێت منداڵ هەندێ شیعر و سروود لەبەر بکات، کە مەبەست لێیان فێرکردنی واتا دروستەکانی ئیمانە.[1]

٣- لە کاتی خۆشی و دڵخۆشیدا وا باشترە ناوی خوا لە لای منداڵ بهێنرێت، پێویستە لەو تەمەنەدا ناوی خوای گەورە بە کرداری سزادان و دڵرەقییەوە نەبەسترێتەوە، وا باشترە قسەی زۆر لەبارەی تووڕەیی و سزا و دۆزەخی خوای گەورە نەکرێت.

٤- ئاراستەکردنی منداڵ بەرەو جوانی لە ڕەوشت و هێز و یەکگرتوویی، بۆ ئەوەی هەست بە پیرۆزی و تواناکانی خوای بەدیهێنەر بکات و خۆشی بوێت، چونکە خوای گەورەیش ئەوی خۆش دەوێت و بوونەوەرانی خستووەتە خزمەتی.

٥- ڕاهێنانی منداڵ لەسەر ئادابی ڕەفتارکردن، فێرکردنی سۆز و بەزەیی و هاوکاری و ئادابی گفتوگۆ و گوێگرتن، چاندنی نموونەی ڕابەرایەتیی دروست لەسەر ڕێگەی ئیسلامەتی، ئەمەیش وا دەکات کەشوهەوایەکی بۆ بڕەخسێنێت، کە پڕ بێت لە گەورەیی و ڕێز و شکۆ، دەوروبەر سوود لە چاکەی ببینێت.[2]

---

[1] بۆ زانینی گرنگیی سروودەکان لە ژیانی منداڵدا، سەیری (القيم الدينية والأخلاقية في أناشيد الأطفال، قحطان بيرقدار، شبكة الألوكة) بکە، مێژووی بلاوکردنەوەی ١٤٢٩/١١/٢٥هـ. هەروەها گرنگیی سروود لە کرداری فێرکردن، أمجد قاسم، ماڵپەری (آفاق عملية وتربوية)، مێژووی بلاوکردنەوە ٢٠١٣/٦/١٢م. هەروەها (ڕۆڵی سروود لە پەروەردەی منداڵی موسڵماندا، رفعت المرصفي) ماڵپەری (رابطة أدباء الشام) مێژووی بلاوکردنەوە ٢٠١٣/١/٥م.

[2] سەیری (التربية العقائدية، د. محمد حاج الجزائري) بکە لە ماڵپەری (طريق الإصلاح)، هەروەها سەیری (التربية الدينية للإطفال، خولة درويش) بکە لە ماڵپەری (صيد الفوائد)،

بەڵام سەبارەت بە قۆناغی دوای پێگەیشتن (دوای تەمەنی ٧ ساڵان)، چەند شێوازێکی پەروەردەیی تر هەن، کە بیرکردنەوە و تێڕامانیان دەوێت، لەوانە:

١- گەورەیی و وردەکاریی دروستکردنی ئەم گەردوونە و مەحکەمی و بێ کەموکوڕییەکەی بە منداڵ فێربکرێت، بۆ ئەوەی پەروەردگار بە گەورە بزانێت، وەك پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ صُنۡعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِيٓ أَتۡقَنَ كُلَّ شَيۡءٍ ﴾ النمل: ٨٨

واتە: "ئەمەیە دەستکردی ئەو خوایەی، کە هەموو شتێکی بەوپەڕی ڕێکوپێکی دروستکردووە".

٢- بیرهێنانەوەی حیکمەت و داناییەکانی خوای گەورە لە کردەوە و دروستکراوەکانی، بۆ ئەوەی خوای گەورەی خۆش بوێت و سوپاسی بکات، وەك حیکمەتی دروستکردنی شەو و ڕۆژ، دروستکردنی خۆر و مانگ، دروستکردنی هەستەوەرەکانی مرۆڤ (بینین، بیستین، تامکردن و... هتد) خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿ أَوَلَمۡ يَتَفَكَّرُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۗ مَّا خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَآ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ ﴾ الروم: ٨ [1]

واتە: "ئایا ئەوە لە ناخی خۆیاندا بیرێکیان نەکردووەتەوە، کە خودا

---

سەیری (أطفال المسلمین کیف رباهم النبي الأمین، جماع عبدالرحمن) بکە، (لا ٤٠).

[1] سەیری (التربیة العقائدیة، د. محمد حاج الجزائري) بکە، ماڵپەڕی (طریق الإصلاح)، هەروها سەیری (مختصر الصواعق، لابن القیم) بکە، (لا ٢٢٦)، بە جوانترین وشە باس لە حیکمەتی خوای گەورە لە دروستکراوەکانیدا دەکات، هەروەها دەکرێت سوود لە کتێبی (عجائب خلق الله، عمر الاشقر) وەربگیرێت.

ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی لـە نێوانیانـدا هەیـە تـەنیا بـە حـەق و سنووردار نەبێت دروستی نەکردوون؟"

٣- سوودوەرگرتن لەو ڕووداوانەی دێنە پێش، بیرکردنەوەی منداڵ بە ڕێگەیەکی حەکیمانە ئاراستە بکرێت و چاکە و خێری خۆش بوێت و خۆی لە خراپە بپارێزێت، بۆ نموونە: ئەگەر نەخۆش کەوت، دڵی ببەستینەوە بـە خوداوە، فێری نزاکردن و گومانی باشی بکەین، کاتێك خواردن و میـوە و شیرینی بۆ دەهێنین داوای لێ بکەین سوپاسی خوا لەسەر ئەم بەخششـانە بکات و پێی ڕادەگەیەنین، کـە سـەرجەم بەخششـەکان لـە لایـەن خـوای گەورەوەن. با دایکان و باوکان خۆ بـە دووربگـرن لـە فێرکردنـی هەنـدێ تێگەیشتنی ئیمانی لە بوونی هەندێ ڕووداوی بەئازار بۆ منداڵان، چونکە هێشتا توانای هۆشیاریی تەواوی نییە بۆ جیاکردنەوە.[١]

٤- پێویستە بە ئەنجامدانی هەندێ کـردەوە منـداڵ لەسـەر هەنـدێ نـەریتی ئیسـلامی ڕابهێنرێـت، بۆیـە باشـترە کەسـی پـەروەردەکار بـە ڕەفتارەکانی نموونەیەکی جوان نمایـان بکـات بـۆ ئـەوەی منـداڵ بیکاتـە پێشەنگی خۆی. بەستنەوەی ئایین بە بەها جوانەکان لەمیانـەی ڕەفتـار و مامەڵەکردنـدا، دەبێتــە هــۆی ئــەوەی پەروەردەکــەمان پەروەردەیــەکی کرداریی ڕاستگۆیانە بێت و بەتەنیا قسەکردن نەبێت.[٢]

٥- سوودوەرگرتن لە چیرۆکی سوودبەخش، بۆ ئەوەی منداڵ لە شتی باش تێبگات و خۆبەدووربگرێت لە شتی خراپ، باشـترە چـیرۆکەکان بـە شێوەی نمایشی کاریگەر نیشانی بدرێن و بەها جوانـەکانی تێـدا گـەورە

---

[١] کتێبی (غرس أصول الإيمان في نفس الطفل، د. شريفة الحازمي)، (لا ٦٥ - ٦٩).
[٢] سەیری (منهج التربية النبوية للطفل، محمد سويد) بکە، (لا ٣٧٩).

بکرێن. دەکرێت لە ڕێگەی سروود و هۆنراوەوە نموونەیەکی باڵای ڕەوشتبەرزی لە دڵیدا بچێنرێت، هەروەها دەکرێت منداڵ شارەزا بکرێت بە ژیانی پێغەمبەر ﷺ لە ڕێی ژیاننامەکەی، بۆ ئەوەی تاموچێژی لێ ببینێت" هەروەها فێری مامەڵەکردن بکرێت لەگەڵ منداڵانی تر بە نەرمونیانی و ڕەوشتبەرزی، خوێندنەوەی چیرۆکی هاوەڵان و دایکانی باوەڕداران (ڕەزای خوا لەسەر هەموویان بێت).[1]

٦- میانگیری لە پەروەردەی ئایینیی منداڵدا، ئەو شتەی توانای هەڵگرتنی نییە بەسەریدا نەدرێت، چونکە نابێت لە بیرمان بچێت گاڵتە و یاری هەردووکیان جیهانی ڕەسەنی منداڵانن" بە شتێك ماندووی مەکە، کە پێچەوانەی گەشە سروشتی و دەروونییەکەی بێت و بە ماندووبوون بارەکەی لەسەر قورس بێت و لە هەندێ پێویستییە بنەڕەتییەکانی منداڵی بێبەش ببێت، چونکە زیادەڕۆیی لەم بابەتە و زۆر ڕەخنەگرتن لێی کاریگەریی نەرێنی و هەستکردن بە گوناهی لە لا دروست دەبێت، بەزۆرییش ئەم ڕووداوانە لەگەڵ یەکەم منداڵی خێزاندا ڕوودەدەن، بۆ ئەوەی باوکەکەی منداڵەکەی بکاتە نموونەیەکی باڵا و بێ کەموکوڕی.

٧- پێویستە منداڵ لەسەر سروشتەکەی خۆی بەجێبهێڵرێت، بێ ئەوەی گەورەکان بەبەردەوامی دەستوەربدەنە سروشتەکەی، ئەمەیش بۆ

---

[1] کتێبی (طفل یقرأ، د. عبدالکریم بکار- لا ٦٧)، دکتۆر لەم کتێبەدا بە هەنگاوی کرداری باسی هونەری گێڕانەوەی چیرۆك لەسەر منداڵ دەکات، دەکرێت سوودیش لە کتێبی (أعظم إنسان عرفته البشریة، هشام برغش) وەربگیرێت (لا ١٤٣)، سەیری کتێبی (کیف نزرع حب الحبیب ﷺ في الناشئة، أمینة دراعو) بکە، (لا ٣٣-٣٦)، هەروەها سەیری کتێبی (خمسون موقفا للنبي ﷺ مع الصغار، د. إبراهیم الودعان) بکە، دەکرێت سوود وەربگیرێت لە کتێبی (رجال و نساء حول الرسول للأطفال، سید مبارك).

ئــەوەی منداڵەکــە کەشــێکی وای بــۆ بڕەخســێت بــەگوێرەی توانــا و هەستەکانی خۆی بۆ دەوروبەر شتەکان بناسێت، ئەم کــارەیش گەشــە بــە حەزی گەڕان و بەکارخستنی تواناکانی دەدات.

٨- هاندانی منداڵ کاریگــەریی ئــەرێنی لەســەر دەروونــی دروســت دەکات، وای لێ دەکات تەواوی تواناکانی سەرف بکات بۆ ئــەو کارانــەی قەبووڵکراون، هەر کاتێك ڕێکخســتنی ڕەفتــاری منــداڵ لەســەر بنــەمای خۆشەویستی و پاداشت بــوو، دەبێتــە هــۆی بەدەســتهێنانی ڕەفتــارێکی دروست بە ڕێگەیەکی جوان، پێویستە منــداڵ فێــری مافــەکانی بکرێــت" بزانێت چ مافێکی هەیە و چ ئەرکێکی لەسەر شانە، یان چ شــتێك باشــە بیکات و چ شتێك نەکات، هاوکات لەگەڵ هەستکردنی منداڵ بە پێگە و ڕێزی خۆی، بەڵام بە جوانی ئەمە ڕێکبخرێت دوور بێت لە پێدانی ناز.[1]

٩- بە شێوازێکی ئاسان و سەرنجڕاکێش بابەتی ڕێزگــرتنی قورئــان و بەگەورەزانینی لە دڵی منداڵ بچێنرێت، بۆ ئەوەی هەســت بــە پــیرۆزی و پابەندبوون بە فەرمانەکانی بکات، بزانێــت ئەگــەر بــەجوانی بیخوێنێــت دەگاتە ئاستی فریشتە بــەڕێزەکان، لەســەر ئــادابی خوێندنــەوەی قورئــان ڕابهێنرێــت - وەك الاستعاذة و البسملة و ڕێزگــرتن لــە قورئــان و بــاش گوێگرتن لێی -" هەروەها منداڵ لەسەر گوێگرتن لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز ڕابهێنرێت، چونکە ئەم کارە توانا زمانەوانییەکە زیاد دەکات و بــۆ خوێندنەوە هانی دەدات. دەکرێت فێری تەفسیری هەندێ ئایــەت بکرێــت، کە واتای بیروباوەڕ لە خۆدەگرن - لە نموونــەی: **الفاتحــة، الإخــلاص، الفلــق والنــاس**- وا باشــە چــیرۆکەکانی قورئــانی بەئاســانی و بــەدووبارەیی بــۆ

---

[1] سەیری (البناء النفسي والوجداني للطفل، د.صلاح عبالرزاق) بکە، (لا ٩).

بگێڕدرێتەوە و بە ڕێگە و شێوازی جیا جیا بۆی نمایش بکرێت.[١]

١٠- دەکرێت لە شێوازی پرسیار و وەڵامدا وەبەرهێنان بکرێت، بەوەی سووربین لەسەر ئەوەی پرسیارەکان ئەو زانیارییانە لەخۆبگرن، کە دەمانەوێت بیانگەیەنینە منداڵەکانمان، وەڵامەکانیش لە چەند وشەیەکی کورتدا چڕبکرێنەوە" بە جۆرێك لە گەڵ تەمەن و ئاست و تێگەیشتنیاندا بگونجێت. ئەم جۆرە ڕێگەیە کاریگەریی گەورەی لەسەر بەدەستهێنانی بەها و ڕەوشتی جوان لای منداڵ دەبێت، ڕەفتارەکانی بەرەو باشتر دەبات.

١١- دەکرێت وەبەرهێنان بکەین بە ڕێگەی تاموچێژی ڕەنگکاری، بە جۆرێك ئەو وێنەیەی دەمانەوێت ڕەنگی بکەین واتای ئیمانی لەخۆبگرێت و هەر جارەو بە شێوازێك دووبارە ببێتەوە. باشترە ئەم کارە بە شێوەی پێشبڕکێ بێت، کە بوارەکەی فراوان و جۆراوجۆرە، باشتریشە پێشبڕکێکە بە شێوازی جوولەیی بێت، چونکە منداڵ ئەم ڕێگەیەی پێخۆشە و لەگەڵی ئاوێتە دەبێت.[٢]

١٢- هەندێ فەرموودەی بیروباوەڕ (عەقیدە) بۆ منداڵ شی بکەینەوە، کە لەگەڵ ئاستی بیکردنەوەیدا بگونجێن، بە شێوازێکی ئاسان و خۆشکراو بە دەستەواژەی کورت و پوخت، کە مێشکی بتوانێت وەریبگرێت[٣]، هەروەها بە شێوەی دووبارەکردنەوەی دەستەواژەکان باوەڕ

---

[١] سەیری (التربية الدينية للأطفال، خولة درويش) بکە لە ماڵپەری (صيد الفوائد)، هەروەها سەیری کتێبی (كيف أجيب عن أسئلة طفلي وأحاوره، د. سلوى مرتضى) بکە، (لا ١٠٨).

[٢] سەیری (الارتقاء بالأسرة في تعظيم محبة النبي ﷺ الأمية) بکە، (لا ٥).

[٣] دەکرێت سوود لە کتێبی (منهاج الطفل المسلم، محمود المصري) و فەرموودەی منداڵان (باخچەی ساوایان و مامۆستایان و پەروەردەکاران)، هەروها شەرحی دە فەرموودە بۆ

لە لای گەشە دەکات، تا وای لێ دێت بتوانێت بەکاریان بهێنێت، وەك: (**قَدَّرَ اللهُ وَماشاءَ فَعَل**). واتە: "قەدەری خوایە، چیی بوێت دەیکات"، یان (**تَوكَلْ على الله**). واتە: "پشت بە خودا ببەستە"، یاخود (**اللهُ عَلَى كُلِّ شَيءٍ قَدِير**). واتە: "خوای گەورە بەسەر هەموو شیتکدا بەتوانایە".

منداڵ بە یارمەتیی باوانی، یان پەروەردەکارەکەی دەتوانێت پۆل و ژوورەکەی بە دەستەواژی ئیمانیی جوان برازێنێتەوە، لە نموونەی "**من موسڵمانم**"، "**من خودام خۆش دەوێت**"، "**پایەکانی ئیمان**"... ئەمانە هۆیەکانی فێرکردنن و بە زۆر سەیرکردنیان لە مێشکیدا دەچەسپێن.[1]

١٣- منداڵ فێربکەین، کە هەرگیز بابەتی تاقیکردنەوە لێی جیا نابێتەوە، خوای گەورە هەموو بەندەکان لە دونیادا بە هەندێ نەهامەتی و ناخۆشی تاقی دەکاتەوە. فێری بکەین، کە خوای گەورە فەرمان بە شتێك ناکات، مەگەر ئەوەی حیکمەتێکی زۆری لە پشتەوە بێت. لە دڵی بچەسپێنین، کە ئەوەی سوود و قازانج دەهێنێت و ناخۆشی و زیان دووردەخاتەوە، تەنیا خوای گەورەیە، سۆز و بەزەیی پێش توورەبوونی کەوتووە. بۆی روون بکەینەوە، کە بەردەوام دوای ناخۆشی، خۆشی دێت. ئەمەیش سوننەتێکی کۆنی خوای گەورەیە. بیری گومانبردنی باشی لە لا گەورە بکەین، کە ئەمەیش بۆ خۆی خواپەرستییە. دەبێت بزانین

---

منداڵان، هەرووکیان لە ماڵپەری (شبكة الألوكة)دا بڵاوکراونەتەوە، هەروەها کتێبی (منهج التربية النبوية للطفل، محمد سويد)، (لا ٤١٨).

[1] سەیری (كيف تعلم العقيدة للأطفال، هيا الصنيع، موقع صيد الفرائد) بکە، هەروەها سەیری (أطفال المسلمين كيف رباهم النبي الأمين، جمال عبدالرحمان) بکە، (لا ١٤٣).

هەڵبژاردنی خوای گەورە لە هەڵبژاردنی خۆمان باشترە بۆمان، مرۆڤیش هیچی لەسەر نییە، مەگەر ئارامگرتن، پێویستە لە مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم نەهامەتییانەدا دەست بە هۆکاری شەرعییەوە بگیرێت و خۆی بە خشڵی ڕازیبوون برازێنێتەوە و چاوەڕێی پاداشت بکات... لە کۆتاییدا فێری بکەین، کە دەست بگرێت بە نزا و پاڕانەوەوە، چونکە ئەمە بازرگانییەکە، کە بەندە بەردەوام تیایدا قازانج دەکات.[١]

## هۆیەکانی پەروەردە:

**لە گرنگترین هۆیەکانی پەروەردەیی، کە یارمەتیی چاندنی ئیمان دەدەن لە دڵی منداڵدا، ئەمانەن:**

١- **پێشەنگبوونی جوان:** پێشەنگبوون لە گرنگترین و گەورەترین ئەو شێوازانەن، کە کاریگەریی قووڵیان لەسەر دڵ و دەروونی منداڵ هەیە. بەدڵنیاییەوە پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی بە گرنگیی پێشەنگبوون داوە لە ژیانی منداڵدا، لە فەرموودەییەکدا، کە (عبداللە)ی کوڕی (عامر) ﷺ دەیگێڕێتەوە، دەڵێت: ڕۆژێکیان کاتێ پێغەمبەری خوامان ﷺ لە لا بوو، دایکم بانگی کردم، پێی وتم: ئەی عەبدوڵڵا وەرە با شتێکت بدەمێ، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو (**دەتەوێت چیی بدەیتێ؟**) دایکم وتی: دەمەوێت خورمای بدەمێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (**ئەگەر هیچی**

---

[١] سەیری (قواعد في تلقي المصائب، د. عمر المقبل) بکە لە ماڵپەری (د. عمر المقبل)، مێژووی بڵاوکردنەوە ٢٠١٤/١٢/٣م" هەروەها سەیری حال الإنسان عند حلول المصيبة، ظافر آل جيعان) بکە لە ماڵپەری (صيد الفوائد) بکە.

**نەدەیتێ، ئەم کارەت بە درۆکردن لەسەر دەنوسرێت).**[1] لە گێڕانەوەیەکی تردا دەفەرموێت: (**هەرکەسێك بە منداڵێك بڵێت وەرە شتێکت بدەمێ، پێی نەدات، ئەوا درۆی کردووە).**[2] بۆیە پێشەنگبوون شێوازێکی کاریگەرە، ئەم فەرموودەیەش بەدیاریکراوی گرنگیی ڕاستگۆیی لەگەڵ منداڵان دەردەخات.[3]

٢- **ئامۆژگاریی ڕاستگۆیانە:** دەکرێت ئامۆژگاریی بە چەند شێوازێك ئاراستە بکرێت، ئینجا یان بە شێوازی ڕاستەوخۆ و باو، یان لە ڕێی نموونەهێنانەوە، یان لەمیانەی گێڕانەوەی چیرۆکیك" یاخود بە شێوازی گفتوگۆ و... هتد. پێویستە منداڵ لە وەرگرتنی ئامۆژگاری سەرپشك بکرێت بۆ ئەوەی تووشی بێزاری نەبێت.[4]

٣- **هاندان و ترساندن:** ئەم دوو ڕێگەیە بە شێوازی (پاداشت و سزا)یش گوزارشتی لێ دەکرێت، ئەم جۆرەیان لە دیارترین شێوازە سۆزدارییەکان دادەنرێت، بەوپێیەی بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ بەر فیترەتی خۆرسکی منداڵ دەکەوێت، ئەو فیترەتەی خوای گەورە لەسەری خولقاندوویەتی، کە بریتییە لە حەزکردن لە کاری بەسوود و ڕقلێبوونەوە

---

[1] ئەبو داود گێڕاویەتییەوە (٤٩٩١) ئەلبانی بە "حەسەن"ی داناوە.

[2] ئەحمەد گێڕاویەتییەوە (٤٩٩١) ئەلبانی بە "حەسەن"ی داناوە.

[3] سەیری (دور البيت في تربية الطفل المسلم، خالد الشتوت) بکە، (لا ٣٠). هەروەها سەیری (منهج التربية النبوية للطفل، محمد سويد - لا ٩٠)، (السنة النبوية رؤية تربوية، د.سعيد علي- لا ٣٥٦)، (اساليب الرسول ﷺ في تربية الأسرة المسلمة، شافع الحمادي — لا ٣)، (تربية الشباب الأهداف والوسائل، د. محمد الدويش- لا ٩)، (خمسون موقفا للنبي ﷺ مع الصغار، د. ابراهيم الودعان- لا ٩) بکە.

[4] سەیری (السنة النبوية رؤية تربويية، د. شريفة الحازمي) بکە، (لا ٤). دەکرێت سوود لە کتێبی (مواعظ الصحابة، د. عمر المقبل) وەربگیرێت.

لە کاری زیانبەخش و خۆبواردن لێی" بۆیە پێویستە ئەم ڕێگەیە زۆر بە ڕاستی و دادپەروەرانە جێبەجێ بکرێت و زیادەڕۆیی تێدا نەکرێت. منداڵ خاوەنی دەروونێکی ناسکە، پێویست ناکات بتۆقێنرێت، چونکە لەوانەیە کاریگەرییەکەی پێچەوانە ببێتەوە، بۆیە وا باشترە لەم قۆناغەدا لایەنی (هاندان) زاڵ بکرێت، چونکە منداڵ لەم قۆناغەیدا زیاتر پێویستی بە (هاندانە)، نەك (ترساندن).[1]

٤- **ڕاهێنان و شارەزاییکردن:** ڕاهێنانی منداڵ لەسەر سووربوون لە بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوای گەورە، ترسان و شەرمکردن لێی، لەسەر پشتبەستن بەو زاتە لە هەموو کاتێك، لەسەر ئەوەی، کە هەموو کارێك بەدەست ئەوە" هەموو ئەم جۆرە ڕاهێنانانە هێز و خۆراکی بەرامبەر ناخۆشییەکان پێدەبەخشن، هەروەها بڕوابەخۆبوون و دڵنیاییەکی دەدەنێ، کە دڵی پێی ئارام دەبێت و دەروونی پێی بەختەوەر دەبێت.

٥- **دووبارە و چەندبارەکردنەوە:** زانستی سەردەم سوودی ئەم شێوازەی لە ڕووی فێرکردن و چەسپاندنی زانستی لە مێشکی منداڵدا سەلماندووە.[2]

٦- **گفتوگۆکردن:** گفتوگۆکردن لەگەڵ منداڵ تێگەیشتن و ئاسۆی زانیاریی فراوان دەکات، بەڵام لێرەدا پێویستە ڕێز لە ڕای منداڵ بگیرێت، بەجوانی گوێی بۆ بگیرێت و بەهێمنی قسەی لەگەڵ بکرێت، بۆ ئەوەی

---

[1] سەیری (غرس أصول الإيمان في نفس الطفل، د. شريفة الحازمي) بکە، (لا ١٢٥). هەروەها سەیری (دور البيت في تربية الطفل المسلم، خالد الشنتوت) بکە، (لا ٢٥). یان سەیری (أساليب الرسول ﷺ في تربية الأسرة المسلمة، شافع الحمادي) بکە، (لا ١٩).

[2] سەیری (منهج التربية النبوية للطفل، محمد سويد) بکە، (لا ١٣٩).

گفتوگۆیەکی سەرکەوتوانە لەگەڵ منداڵ بەرهەم بێت" لەمیانەیدا منداڵ پەروەدە بکرێت.[1]

٧- **کتێب:** بوونی کتێبخانەیەکی بچووك و خنجیلانە لە ماڵەوە و گونجانی لەگەڵ ئاستی زانستی و ڕۆشنبیری و ئیمانیی منداڵ پێویستە، باشتریشە کتێبەکان هەمەجۆر - خوێنراو، بیستراو و ژمارەیی- بن، زۆریش گرنگە ئەو کتێبخانەیە کۆمەڵە چیرۆکێکی تێدا بێت، چونکە چیرۆك هۆیەکی فێرکردنی پڕبایەخە.[2] لە ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانیدا چیرۆکی زۆر گرنگ و کاریگەر هەن، کە دەکرێت سوودیان لێ وەربگیرێت.[3]

٨- **تەکنەلۆژیای نوێ و هۆیەکانی فێرکردن:** ئەمانەیش ئامرازێکن یارمەتیدەرن لە نزیککردنەوە و چەسپاندنی بیرۆکەکان لە مێشکی منداڵدا، کە وای لێ دەکات لە ماناکانیان تێبگات، ئەم بیرۆکە و بنەمایانە ئێستا بەهۆی تەکنەلۆژیانەوە بە ڕێگە و ڕەنگی سەرنجڕاکێش نمایش دەکرێن، منداڵ کەمەندکێش دەکەن و زەمینەسازی دەکەن بۆ

---

[1] سەیری (غرس أصول الإيمان في نفس الطفل، د.شريفة الحازمي) بکە، (لا ٣٤-٤٥). هەروەها سەیری (السنة النبوية رؤية تربوية، د.سعيد علي) بكة، (لا ٤٠٦).

[2]- سەیری بەشی سێیەم لە کتێبی: (القصة في مجلات الأطفال ودورها في تنشئة الأطفال اجتماعيا، د. أمل حمدي دكاك- الهيئة العامة السوري للكتاب، دمشق الطبعة الأولى ٢٠١٢) بکە.

[3] سەیری (منهج التربية النبوية للطفل، محمد سويد) بکە، (لا ١١٠، ٣٧٠). سەیری (أساليب الرسول ﷺ في تربية الأسرة المسلمة، شافع الحمادي) بکە، (لا ٢١). دەکرێت سوود لە کتێبی (قصص رواها النبي محمد ﷺ، د.عثمان مكانسي) و کتێبی (٣٠ قصە بلسان محمد ﷺ، عصام الشايع) وەربگیرێت.

دەروونی منداڵ بۆ وەرگرتنی زانیاری.[1]

٩- **پاڵنەرە خۆڕسکەکان:** هەندێ پاڵنەری جۆراجۆر لە لای منداڵ هەن پێویستە وەبەرهێنانیان لەسەر بکرێت، لەوانە: یاری و یارمەتیدان و لاساییکردنەوە و... هتد، منداڵ لە ڕێگەی یاریکردنەوە دەتوانێت جیهانی دەوروبەری بدۆزێتەوە و گوزارشت لە تێگەیشتن و بۆچوونەکانی بکات، بۆیە دەکرێت بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو مانا دروستانەی لەبارەی گەردوون و ژیان هەیەتی و بۆ چاندنی بەهاکان لە دڵی منداڵدا وەبەرهێنان لەسەر ئەم پاڵنەرانە بکرێت" ئەویش بە شێوازێکی ئاسان و گونجاو، چونکە وەبەرهێنان لەم هەڵوێست و ڕووداوانەدا بە شێوەیەکی جوان بۆ پەروەردەکردن[2]، شوێنەواری قووڵ و کاریگەر لە دەروونی منداڵدا بەجێدەهێڵێت.

١٠- **نزاکردن:** نزا و پاڕانەوە بەڵگەی پێویستی و نیازمەندیی بەندەیە بە خوای پەروەردگار و پاڕانەوەیە لە گەورەیی و فەزڵی ئەو زاتە، خوای گەورە هانی نزاکردن دەدات و بەڵێنی وەڵامدانەوەیشی دەدات، دەفەرموێت:
﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ ﴾ غافر: ٦٠

واتە: "ئەی خەڵکینە! پەروەردگارتان فەرموویەتی: ئێوە هانا و هاوار بۆ من بهێنن، منیش دۆعا و نزاتان گیرا دەکەم".

نزاکردن لە گەورەترین هۆیەکانی پەروەردەکارانن بۆ گەیشتن بە ئامانجە

---

[1] سەیری (دور الأنشطة غير الصفية في تنمية حب النبي ﷺ لدى تلميذات المرحلة الابتدائية، فوزية البقمي) بکە، (لا ٤٥, ٥٢)

[2] سەیری (غرس أصول الإيمان في نفس الطفل، دز شريفة الحازمي) بکە، (لا ٤٦، ٥٥)، هەروەها سەیری (السنة النبوية رؤية تربوية، د. سعيد علي) بکە، (لا ٣٤٣).

پەروەردەییەکانیان، هۆیەکە گەورەی هەموو پەروەردەکاران لەپێناو چەسپاندنی ئیمان و یەکتاپەرستیدا بەکاریان هێناوە، کە پێغەمبەرانن (سلاوی خوایان لەسەر بێت)، وەك پەروەردگار دەفەرمویێت: ﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا ٱلْبَلَدَ ءَامِنًا وَٱجْنُبْنِى وَبَنِىَّ أَن نَّعْبُدَ ٱلْأَصْنَامَ ﴾ إبراهيم: ٣٥

واتە: "کاتێك ئیبراهیم نزای کرد و وتی: پەروەردگارا! بالی هێمنی و ئاسایش بکێشە بەسەر ئەم شار و ولاتەدا و خۆم و نەوەکانیشم بپارێزە لەوەی، کە بتەکان بپەرستین". بۆیە نزا و دوعای منداڵ لە گرنگترین سیما جوانەکانی پەروەردەکەیەتی.[1]

١١- **نواندن و لاساییکردنەوە:** منداڵ بە سروشتی خۆی حەزی لە لاساییکردنەوەیە، بۆ نموونە: با هەلێکی پێ بدرێت، کە هەڵبستێت بە لاساییکردنەوەی ڕۆڵی پێشەوای مزگەوت، نوێژ بکات و قورئان بخوێنێت و وتار بدات، یان لە ڕۆڵی مامۆستادا شرۆڤەی وانە بکات، بەم شێوەیە، ئەمە هاوکار دەبێت لە چەسپاندنی واتاکان" هەروەها بەهای ئەو جۆرە پێگانە دەپارێزێت.

## تایبەتمەندییەکانی پەروەردەکار:

١- **بەزەیی و میهرەبانی:** پەروەردە، ئەگەر بە ڕەوشتی میهرەبانی و نەرمونیانی نەبەسترێتەوە هیچ بەروبوومێکی نابێت، تا ئەو کاتەی

[1] سەیری (منهج التربية النبوية للطفل، محمد سويد) بکە، (لا ١٠٢)" هەروەها سەیری (مواقف تربوية من هدي النبي ﷺ مع الأطفال، د. عبدالمجيد البيانوني) بکە، (لا ٣٨).

دڵەکان نەبنە خاوەنی بەزەیی بەرهەمی نابێت. ئەوەتا (اقرع)ی کوڕی (حابس) دەبینێت پێغەمبەری خوا ﷺ، حەسەن و حوسەین ماچ دەکات، ئەمیش دەڵێت من دە منداڵم هەن، بەڵام هیچیانم ماچ نەکردووە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **(مَن لایَرحم لا یُرحم)**.[1]

واتە: "هەرکەسێك سۆز و بەزەیی لەگەڵ کەسدا نەنوێنێت، سۆز و بەزەیشی لەگەڵدا نانوێنرێت". هەروەها دەفەرموێت: **(الراحمون یَرحَمُهم الرحمن، ارحَموا أهلَ الأرض، یَرحَمکم مَن في السماء)**.[2]

واتە: "خوای گەورە سۆز و بەزەیی بۆ ئەو کەسانە دەنوێنێت، کە خاوەن سۆز و بەزەیین، بۆیە سۆز و بەزەیی بۆ خەڵکی سەر زەوی بنوێنن، تا ئەو زاتەی لە ئاسمانە سۆز و بەزەییتان بۆ بنوێنێت".

٢- **نەرمونیانی و لێبووردەیی:** بەڕاستی سەروەرمان ﷺ گەیشە لووتکەی ئەم ڕەوشتە، لەم ڕووەوە، (انس)ی کوڕی (مالك) دەگێڕێتەوە و دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەڕۆیشتم، پۆشاکێکی (نەجرانی) دامێن ئەستووری لەبەردا بوو، عەرەبێکی دەشتەکی تووشی بوو، بە توندی پۆشاکەکەی ڕاکێشا، کە سەیری گەردنی پێغەمبەری خوام ﷺ کرد بینیم شوێنەواری لێواری پۆشاکەکە لەبەر توندراکێشانی بە گەردنییەوە دیاربوو" ئینجا وتی: ئەی محمد! فەرمان بکە لەو پارەی خوای گەورەی لە لاتە پێم بدرێت، پێغەمبەر ﷺ ئاوڕی بۆ دایەوە، پاشان پێکەنی و فەرمانی کرد پارەی پێ بدرێت.[3]

---

[1] بوخاری گێڕاویەتییەوە (٥٩٩٧).
[2] ئەبو داود گێڕاویەتییەوە (٤٩٤١)، ئەلبانی بە "سەحیح"ی داناوە.
[3] بوخاری گێڕاویەتییەوە (٥٨٠٩).

لێبوردەییش پەیوەندیی بە نەرمونیانییەوە هەیە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ خُذِ ٱلْعَفْوَ وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴾ الأعراف: ١٩٩

واتە: "کاری ئاسان لە خەڵکی داوا بکە و چاوپۆشی لە هەڵە و کەموکوڕییەکانیان بکە، فەرمان بدە بە چاکە و کردەوەیەك کە پەسەندی شەرعە، ڕوویش وەربگێڕە و پشت بکە لە نەفام و تێنەگەیشتوان".

بۆ ئەوەی نەرمونیانی بێتەدی، پێغەمبەر ﷺ هانی خۆڕاگری و تووڕەنەبوون دەدات، لە فەرموودەی سەحیحیدا هاتووە: پیاوێك بە پێغەمبەر ﷺ وت: ئامۆژگاریم بکە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (**تووڕە مەبە**). چەند جارێك ئەمەی دووبارە کردەوە و پێی فەرمووی: (**تووڕە مەبە**).[1]

٣- **ئارامگرتن:** پێویستە پەروەردەکار خۆی بڕازێنێتەوە بە ئارامگرتن و پەلەنەکردن لەمیانەی پەروەردەکردن و فێرکردنی منداڵان، با پەروەردەکار پەلە نەکات لە بەدەستهێنانی ئەو ئامانجەی هەوڵی بۆ دەدات، بۆ ئەوەی ئەوکات نائومێدی و هەستکردن بە شکست باڵی بەسەردا نەکێشێت. ئەگەر پەروەردەکار ئارامی نەبێت، وەك ئەو گەشتیارە وایە، کە خواردنی پێ نەبێت.

٤- **دادگەری:** ئەگەر بەبێ بوونی هۆیەکی ڕوون جیاوازی کرا لە نێوان تاکەکان، ئەوکات ئاوێتەبوون و تێکەڵاوبوون لە نێوانیاندا ڕوونادات، ستەمکاری لە هەرشتێکدا هەبێت ناشرینی دەکات.

٥- **دەستپاکی:** پێویستە لەسەر کەسی پەروەردەکار ڕاستگۆ و

---

[1] بوخاری گێڕاویەتییەوە (٦١١٦).

دەستپاك بێت لە مامەڵەکردنی لەگەڵ منداڵان، دەستپاکی لە سیفەتی پێغەمبەرانە، هۆکارێکی پێویستە بۆ جوانکردنی کارەکان و گەیشتن بە ئامانج و سەرکەوتنەکان.

٦- **لە خواترسان:** ئەو کەسەی لە خوا بترسێت، خوای گەورە لە کار و کردەوەکانیدا سەرکەوتووی دەکات. لە خواترسان (التقوى) بەستراوەتەوە بە سەرفرازی و چاکسازی و سەرکەوتن لە دونیا و دوارۆژدا.

٧- **دڵسۆزی:** لەبەر ئەوەی، ئەگەر کارێك مەبەست لێی خوای گەورە نەبێت، ڕەتکراوەیە و دەدرێتەوە بە نێوچاوی خاوەنەکەیدا، ئەوکات جگە لە ماندووبوون هیچی تری بۆ نامێنێتەوە.

٨- **زانست:** چونکە زانا بەرچاوی ڕوونە بەرامبەر ئامانجەکان، بە پێچەوانەوەی نەفام، کە ئێستا و داهاتووی بە خەسارەت دەدات.

٩- **دانایی:** کاتێك پەروەردەکار هەموو شتێك لە شوێنی گونجاوی خۆی دادەنێت، ئەوکات هەموو کارێك بەرهەمی دەبێت، پەروەردەیش بەرووبوومی دەبێت، ئەرکی پەروەردەکار ئەوەیە بەلێزانی بچێتە ناو دەروونی منداڵ و بەرەو پەروەردەیەکی جوان ئاراستەی بکات.

١٠- **باوەڕبوون بە کاری پەروەردەیی:** پەروەردە بەرهەمی دەروونی و ڕۆحییە، ئەو کەسەی بڕوای بە کاری پەروەردەیی نەبێت، ناتوانێت ئەم جۆرە بەرهەمە پێشکەش بکات.[١]

---

[١] سەیری (تربية الناشئة في القرآن الكريم، صباح الطليان) بکە، (لا ٢١١، ٢٢٦)، سەیری (التربية في السنة النبوية ابو لبابة حسين) بکە، (لا ٢٥٣). هەروەها سەیری (أساليب الرسول في الدعوة والتربية، يسوف الصوري) بکە، (لا ٢٥٣).

١١- **پێشخستن:** کەسی پەروەردەکار گرنگی بە پێشخستنی تواناکانی خۆی بدات، بە جۆرێك بگاتە ئەو ئاستەی، کە یارمەتیی دەدات لە ئەدای ڕۆڵی پەروەردەییەکەی.

## پایەکانی پەروەدەی ئیمانی[١]

## پایەی یەکەم: باوەڕبوون بە خودا

فیترەت و عەقڵ و ئایین سەلمێنەری بوونی خوای مەزنن، هەرچی دروستکراوە لەسەر باوەڕبوون بە دروستکارەکەی فیترەتی وەرگرتووە، عەقڵیش دەڵێت دەبێت ئەو دروستکراوانە بەدیهێنەرێکیان هەبێت" سەبارەت بەئایین، ئەوە هەرچی ئایینە ئاسمانییەکانە دان بە بوونی بەدیهێنەردا دەنێن.

باوەڕبوون بە خودا چوار لایەن لەخۆدەگرێت:

**یەکەمیان:** باوەڕبوون بە بوونی خودا.

**دووەمیان:** باوەڕبوون بە پەروەردگار، کە بەخشەر و ڕێکخەر و ڕۆزیدەرە.

---

[١] دەکرێت سوود لە فێربوونی بیروباوەڕ بە شێوەیەکی ئاسانکراو و پوختەکراو ببینرێت، لە کتێبی (هذه عقیدتي)ی د. طارق البکري، گۆڤاری (الفاتح - ژمارە ١٤٢)، (پرسیارەکان لە بیروباوەڕی منداڵان)دا لە ماڵپەری (شبکة الألولة) بڵاوکراوەتەوە" هەروەها پاشکۆی دووەم لە کتێبی (عقیدة الطفل المسلم)ی هیام محمود.

**سێیەمیان:** باوەڕبوون بە خودا و یەکتاپەرستی، کە هیچ هاوبەشێکی نییە.

**چوارەمیان:** باوەڕبوون بــە نــاو و ســیفەتە بەدیهێنــەرەکانی کــەماڵ و جوانیی زاتی پەروەردگار.[1] پێویســتە منــداڵ فێــری ئــەم چــوار لایەنــە بکەین، ئەوکات لەسەر ناسین و خۆشەویستیی خــوای پــەروەردگار گــەورە دەبێت، ئەم پایەیەیش بناغەی پایەکانی دیکەیە.

## بۆچی خۆشویستنی خوای پەروەردگاریان فێربکەین؟

١- چونکە پەروەردگار ئێمەی لە نەبوونەوە هێناوەتە بوون، دروستی کردووین و فەزڵیشی داوین بەسەر زۆربەی دروستکراواندا، بە گــەورەترین بەخشــش چــاکەی لەگــەڵ کــردووین، کــە ئیســلامە" پاشــان بەخشــش و نازونیعمەتی زۆری پێ بەخشیوین بێ ئەوەی شایەنیان بین، دواتر هەر ئەوە بەڵێنی بەهەشتی پێداوین وەك پاداشتێك بەرامبــەر کردەوەکــان. هــەموو ئەمانەیش لــە بەخشــش و فەزڵــەکانی ئــەو زاتــەن، هــەر ئــەو شــایەنی گەورەییە لە سەرەتا و کۆتایدا...

٢- چونکە خۆشەویستیی خوای گەورە، ڕێزگرتنی بە شێوەی ئاشکرا و پــەنهانی لــێ دێتــە کایــەوە. ئێمــە چــەند پێویســتمان بەوەیــە، کــە منداڵەکانمان ڕێز لــە خــودای موتــەعال بگــرن و لــە کــاری خــراپ لێــی بسڵەمێنەوە، نەك ئەوەی پەیوەندییان لەسەر بنــەمای تــرس و ســزا، یــان

---

[1] الأساليب النبوية لتنمية القيم الإيمانية لدى الشباب المسلم في ضوء التحديات المعاصرة، الطيب، أحمد الشنقيطي، (ص ٨٤، ٨٥).

دۆزەخ بێت، چونکە ئەگەر پەیوەندییەکان لەسەر بنــەمای ڕێزگــرتن بێــت ئەوکات خواپەرستییان بریتی دەبێت لە تاموچێژی ڕۆح" لەگەڵی دەژیــن و لە خراپەیش دەیانپارێزێت.

٣- چونکە خوای گەورە ڕاگر و سەرپەرشتیاری بەردەوامی ســەرجەم دروستکراوانییەتی، نامرێت، نە وەنەوزە دەیگرێت و نە خــەو دەیباتــەوە، لە هەر شوێنێك بن لەگەڵیانە" زیاتر لە دایك و باوکیان ئاگــای لێیانــە و دەیانپارێزێت، کەواتە پەیوەستبوونیان بەو زاتە و خۆشویستنیان بــۆ ئــەو بە گرنگ دادەنرێت، تــا تێبگــەن پشــتیوانێکی بــە هێزیــان هەیــە، کــە (اللّه)یە.

٤- چونکە گەر خوای گەورەیان خۆش ویســت، قورئانیشــیان خــۆش دەوێت، لەسەر نوێژکردن بەردەوام دەبن. ئەگەر زانییان خوای گەورە جوانە و جوانیشیی خۆش دەوێت، هەر کارێك جوان بێت ئەنجامی دەدەن، ئەگەر زانییان خوای گەورە تۆبەکاران و پارێزکاران و چاکەکاران و ڕاســتگۆیان و ئارامگران و لە خواترسان و پشت بــەخوا بەســتوانی خــۆش دەوێــت، بــە تەواوی توانایان هەوڵ دەدەن بۆ ئەوەی بەم سیفەتانە خۆیان جــوان بکــەن" ئەمــــەیش لــــەپێناو بەدەســــتهێنانی ڕەزامەزانــــدی و خۆشەویســــتی و پارێزگاریی خوای گەورەدا.[1]

ئەگەر زانییشیان خوای گــەورە ناپاکــان و بێبــاوەڕان و لووتبــەرزان و ســنووربەزێنەران و ســتەمکاران و گەنــدەڵانی خــۆش ناوێــت، لــەپێناو خۆشەویستیی خوای پەروەردگار و ڕەزامەندیی ئەودا، بە تەواوی توانایــان

---

[1] سەیری (كيف نحب الله ونشتاق إليه، مجدي الهلالي) بكە، (لا ١٤).

هەوڵ دەدەن خۆیان لەم سیفەتانە بەدووربگرن.

٥- چونکە خوشویستنی خوای گەورە ئەو هەستەمان پێ دەبەخشێت، کە خودا لەگەڵمانە. ئەم هەستکردنە لەگەڵ خۆیدا هەستکردن بە ئارامی و ئاسوودەیی و خۆڕاگری و نیگەراننەبوون دەهێنێت، لە پاشان سەلامەتیی دەروون و جەستە لە نەخۆشیی لێ دێتە بەرهەم، بەڵکو لە هەموویشی گرنگتر سەلامەتبوونە لە گوناه و تاوان.[١]

## چۆن منداڵەکانمان فێری خۆشویستنی خوای پەروەردگار بکەین؟

١- تاکە دەروازە بۆ چاندنی پرسە ئیمانییەکان لە لای منداڵان بریتییە لە دەروازەی هەستی، بەواتایەکی تر: ئێمە بۆ بەهێزکردنی باوەڕی منداڵ بە پەروەردگاری، پشت بە هەستەوەرەکان دەبەستین، دەتوانین وەبەرهێنان لە دیمەنە سروشتییەکانی دەوروبەریدا بکەین، بۆ نموونە: خۆر، باران، با و... هتد، لەمیانەی ئەمانەوە منداڵ فێردەکەین دروستکارێك هەیە ئەم شتانە بەڕێوە دەبات، هانی دەدەین پرسیار و هەواڵپرسین بکات.[٢] هەوڵ دەدەین چاویلکەی ئیمانی لە چاوی منداڵ بکەین بە جۆرێك بتوانێت خۆی بەڵگەکانی بوونی خوای گەورە لە هەموو شتێکدا

---

[١] سەیری (تربیة الطفل في الإسلام، سیما أبو رموز) بکە، (لا ٥٠). هەروەها سەیری (أطفالنا وحب الله، د. أماني الرمادي)، ماڵپەڕی (صید الفوائد)، هەروەها سەیری (کیف نحب الله ونشتاق إلیه، مجدي الهلالي) بکە، (لا ٢٢).

[٢] المربون وتساؤلات الأطفال، نوال الخلیفة، (ص ٣٦ - ٣٩).

ببینێت و بە ئاسۆیەکی زانستی خوێندنەوە و شکیردنەوەی بۆ بکات.[1]
سووردەبین لەسەر دەرخستنی توانا موعجیزەکان و داهێنانە بێ ئەندازەکانی پەروەردگار، لێرەدا لە قورئانی پیرۆزدا، ئاراستەکردنێکی خوایی بۆ سەرنجدان لە بنەمای دروستکردنی مرۆڤ هەیە، کە دەفەرموێت:
﴿ فَلۡيَنظُرِ ٱلۡإِنسَٰنُ مِمَّ خُلِقَ ﴾ الطارق: ٥

واتە: "با ئادەمیزاد تەماشا بکات و سەرنج بدات، کە لە چی دروستکراوە ؟!"

یان دەفەرموێت: "﴿ وَفِيٓ أَنفُسِكُمۡۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ الذاریات: ٢١

واتە: "هەروەها لە خودی خۆیشتاندا بەڵگەی بێسنوور هەن لەسەر زانایی و بەتوانایی و جوانکاریی زاتی بەدیهێنەر، ئایا ئەوە بۆ بیناییتان ناخەنە کار؟"

هەروەها سەرنجدان لە خۆراکی مرۆڤ، کە چۆن و بە چەند قۆناغ بەدیی هێناوە، کە دەفەرموێت: ﴿ فَلۡيَنظُرِ ٱلۡإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ ﴿٢٤﴾ ﴾ عبس: ٢٤، یاخود دەرخستنی توانا بێسنوورەکەی خودای مەزن لە چوارچێوەی سەرنجدان لە دروستکراوەکان، کە بەڵگەن لەسەر گەورەیی ئەو زاتە، وەك دەفەرموێت:
﴿ أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلۡإِبِلِ كَيۡفَ خُلِقَتۡ ﴿١٧﴾ وَإِلَى ٱلسَّمَآءِ كَيۡفَ رُفِعَتۡ ﴿١٨﴾ وَإِلَى ٱلۡجِبَالِ كَيۡفَ نُصِبَتۡ ﴿١٩﴾ وَإِلَى ٱلۡأَرۡضِ كَيۡفَ سُطِحَتۡ ﴿٢٠﴾ ﴾ الغاشية: ١٧ - ٢٠

واتە: "ئایا ئەوە سەرنجی وشتر نادەن چۆن دروستکراوە؟!.. ئایا سەرنجی ئاسمان نادەن چۆن بەرزکراوەتەوە.. ئەی سەرنجی کێوەکان نادەن،

---

[1] جوانب التربية الإسلامية الأساسية، مقداد يالجن. (لا ١٤٧).

چۆن داکوتراون و دامەزرێنراون.. ئەی سەرنجی دەشتەکانی زەوی نادەن چۆن تەخت و هەموار کراون؟"

دەکرێت ئەم واتا گەورانە، کە جوانی دروستکردن و پیرۆزیی دروستکار لەخۆدەگرن بە شێوازی ڕوونکردنەوەی جیا و بە ڕێگەی تەکنەلۆژیای سەردەم لە مێشکی منداڵ نزیك بکەینەوە.[1] منداڵ بە سروشتی خۆی ئەو زاتەی خۆش دەوێت، کە هەموو ئەم شتە جوانانەی بۆ بەدیهێناوە.

٢- فێرکردنی منداڵ بە ناو و سیفەتە بەرزەکانی خوای گەورە، کە بەڵگەن لەسەر جوانی و کەماڵی ئەو زاتە، خوای گەورە (الرحمن) و (الرحيم)ـە، کە بەزەیی و میهرەبانیی هەموو شتێکی گرتووەتەوە. (العفو)ـە لە هەموو هەڵەیەك خۆش دەبێت. (الغفور)ـە، کە لەگەڵ لێخۆشبوون، گوناهەکانیش دەپۆشێت. (الکريم)ـە بێ داواکردن و بێ هۆ دەبەخشێت، (الهادي)ـە هەموو بەندەکانی بۆ ڕێگەی بەسوود ڕێنوێنی دەکات. (الودود)ـە بەندەکانی خۆش دەوێت و خۆشویستراویشە، ئەم زانیارییانە بەبێ سێ و دوو یارمەتیی خۆشویستنی خودا دەدەن.[2]

٣- پێویستە خۆمان بەدوور بگرین لەم جۆرە وشانە: (گەر بە قسەم نەکەیت خوای گەورە سزات دەدات)، پێویستە جیاوازی بکەین لە نێوان ئەم دوو شتەدا، یەکەمیان خوای گەورە سزای ئەو کەسە دەدات، کە سەرپێچیی دەکات، لەگەڵ دووەمیان بەستنەوەی سزای خوا بە

---

[1] سەیری (تربية النناشة في القرآن الكريم، صباح الطليان) بکە، (لا ٣٤, ٣٥). هەروەها سەیری (غرس محبة الله ﷻ في نفوس المدوعين، د. الجوهرة الطريفي) بکە، (لا ١٨).

[2] سەیری (غرس محبة الله ﷻ في نفوس المدوعين، د.الجوهرة الطريفي) بکە، (لا ١٠).

فەرمانبەرداریی من و هەڕەشەکردن لەسەری، چونکە ئەم کارە وا دەکات منداڵ بەقووڵی بیر لە توانا و گەورەیی خوا نەکاتەوە" هیچ پێویست ناکات منداڵ لەسەر هەڕەشەکردن بە خوای گەورە پەروەردە بکەین، بەڵکو پێویستە لە بەرامبەردا خۆشەویستنی خوا و پیرۆززراگرتن و ڕێزگرتنی ئەو زاتەی فێر بکەین[١]، هەر شتێك کاریگەریی خراپی لەسەر منداڵ هەبێت مەیدەنە پاڵ خوای پاك و بێگەرد ﷻ.

٤- کاتێك منداڵ، دایك و باوکی دەبینێت نوێژ دەکەن، یان لەبەر حەرامی کارێك ئەنجام نادەن، لای منداڵەکە ئەو پرسیارە دێتە گۆڕێ، کە بۆ ئەو کارە دەکەن؟ بۆیە پێویستە وەڵامەکە باسی خۆشویستنی خوای گەورە و فەرمانبەرداریی تێدا بێت. ئەم جۆرەیان بریتییە لە پەروەردەکردن بە شێوازی پێشەنگایەتی، چونکە منداڵ لەسەر ڕێچکەی باوانی دەڕوات. یەکێکی تر لەو کاروبارانەی، کە خۆشەویستی لە دڵی منداڵدا دەچێنێت، قسەکردنە لەگەڵی لەبارەی بەهەشت و هەموو ئەو بەخششە نەبڕاوانە، کە پەروەردگار بۆ باوەڕداره لەخواترسەکانی ئامادە کردووە.

٥- کاتێك منداڵ دەگاتە تەمەنێك لە واتای واجباتەکان تێبگات، ئەوکات فێری واجبی خۆشویستنی خوای گەوردە دەبێت، چونکە ئەو پەروەردگارەیە دروستی کردووین و بەجوانی بەدیی هێناوین و ڕۆزیی پێداوین و بەسەر زۆربەی دروستکراوەکانیدا گەورەی کردووین، بە ئیسلام چاکەی لەگەڵ کردووین.[٢] دەبێت منداڵ فێربکەین، کە هەرچی هەمانە

---

[١] (کیف تقولها لأطفالك، بول کولمان) (ص ١٥٧ - ١٥٨)، هەروەها دەکرێت سوود لە کتێبی (عظمة الله تعالى وجل وعز، د. محمد الشريف) وەربگیرێت.

[٢] سەیری (التربية العقائدية، د.محمد حاج الجزائري) ماڵپەڕی (في طريق الإصلاح)، هەروەها

لە بەخششەکانی دەوروبەرمان، هەمووی لە لایەن خوای گەورەوەن. پێویستە فێری بکەین چۆن سوپاسی خوای لەسەر بکات و داوای زیاتری لێ بکات، ئەم شارەزایی پەیداکردنە لە بەخششەکان، پاڵنەری خۆشەویستییە.[1]

٦- فێرکردنی ئەو هۆکارانەی دەبنە هۆی ڕاکێشانی خۆشەویستیی خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی ﷺ، لە نموونەی وتار و کردار.[2]

## پایەی دووەم: باوەڕبوون بە فریشتەکان

باوەڕبوون بە فریشتەکان ئەمانە دەگرێتەوە: باوەڕهێنان بە بوونیان، باوەڕهێنان بە ناوەکانیان و بەو هەواڵە دروستانەی لەبارەی ئەوانەوە هەن و خۆشویستنیان.

**لە گرنگترین واتا پەروەردەییەکان، کە پێویستە سەبارەت بە فریشتەکان لە دڵی منداڵاندا بچێنرێت ئەمانەن:**

١- فێریان بکەین، کە فریشتەکان دروستکراوی خوای گەورەن، لە ڕووناکی (نوور) خەلق کراون. دایکە عائیشە - ڕەزای خوای لێ بێت- دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **(فریشتەکان لە نوور خەلق کراوان، پەرییەکان (جنۆکە) لە بڵێسەی ئاگر، ئادەمیش لەوە خەلق**

سەیری (منهج التربية النبوية للطفل، محمد سويد) بکە، (لا ٢١٢).

[1] سەیری (غرس محبة الله ﷻ في نفوس المدوعين، د. الجوهرة الطريفي) بکە، (لا ١٤).

[2] سەیری (١٠٠ وسيلة ليحبك الله و روسوله، سيد مبارك) بکە، (لا ٥).

**کراوە، کە بۆتان وەسف کراوە)**.[1] وەسفێکی گشتی بەسە، بەبێ چوونە ناو وردەکاری و سروشتی ئەم دروستکراوانەوە.

٢- فێرکردنی ناوی ئەو فریشتانەی ناویان هاتووە، وەك: (جوبریل)، کە ئەمینی فریشتەکانە و سەرۆکیانە، هەر ئەویشە قورئانی بۆ پێغەمبەرمان هێناوە.. (میکائیل) ئەرکی باراندنی بارانی پێ سپێردراوە. ئیسرافیل ئەرکی فووکردن بە (صور)ی پێ سپێردراوە، هەروەها کۆمەڵێك فریشتە هەن عەرشی پەروەردگاریان هەڵگرتووە، کۆمەڵێکی تر هەن پارێزگاریکارن، هەندێکی تر چاودێر و تۆمارکەرن.

٣- ڕوونکردنەوەی ئەوەی، کە فریشتەکان ژمارەیان ئێجگار زۆرە، جگە لە خوای گەورە، کەس نازانێت ژمارەیان چەندە. ئەوان دروستکراوگەلێکن، کە تایبەتن بە ملکەچی و فەرمانبەرداری و جێبەجێکردنی فەرمانەکان. هەریەکێك لەوانە ئەرکێکی هەیە و جێبەجێی دەکات و پابەندیشە پێیەوە.

٤- بێگوناهن، خوای گەورە دەپەرستن بە شێوەیەکی بەردەوام، ساردبوونەوە ڕوویان تێ ناکات، بێزار نابن و خۆیان بەگەورە ناگرن، باوەڕدارانیان خۆش دەوێت و نزایان بۆ دەکەن و بەئیزنی خوا سەریان دەخەن و دەیانپارێزن، لە مەجلیسی یادی خوا ئامادە دەبن و بەدوایان دەکەون.

٥- خۆشویستنی منداڵ بۆ فریشتەکان، ئەویش لە ڕێی ئاشناکردنیان بە سروشتی ئەم فریشتە بەڕێزانە، سروشتی بایەخپێدان و

---

[1] موسلیم گێڕاویەتییەوە (٢٩٩٦).

سووربوونیان بەرامبەر باوەڕداران. ئەم جۆرە کارە گیانی خۆشەویستی بەرامبەر ئەم دروستکراوە پیرۆزەی لێ بەرهەم دێت، چونکە فریشتەکان هەڵدەستن بە یادکردنی خوا (تەسبیحات، داوای لێخۆشبوون و نزاکردن بۆ باوەڕداران)، ئەو باوەڕدارانەی لەسەر ڕێبازی ڕاست بەردەوامن و کاری چاکە دەکەن، دێنە لایان و مژدەی بەهەشتیان پێ دەدەن" سەلاوات لەسەر باوەڕداران دەدەن و سەریان دەخەن و دامەزراویان دەکەن.[1] چاودێرییان دەکەن و کار و کردەوەیان دەپارێزن، چونکە خوای گەورە بۆ پاراستنی بەندەکانی ڕەوانەی کردوون، وەك دەفەرمویت: ﴿ لَهُۥ مُعَقِّبَٰتٌ مِّنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَمِنۡ خَلۡفِهِۦ يَحۡفَظُونَهُۥ مِنۡ أَمۡرِ ٱللَّهِۗ ﴾ الرعد: ١١

واتە: "بۆ خوا هەیە فریشتەی بێشومار، کە بە نۆرە بە دوای یەکدا دێن، تا چاودێریی ئادەمیزاد بکەن لە بەر و پشت و لە هەموو لایەکەوە بیپارێزن بە فەرمانی خوا".

٦- باوەڕبوون بە فریشتەکان پێوستە هاوڕێ بێت لەگەڵ بەرز و پیرۆزڕاگرتنیان، ئەوان بەندە ڕێزدارەکانی خوای گەورەن، نافەرمانیی خوا ناکەن لە هیچ شتێکدا، کە فەرمانیان پێ بدات و هەرچییەکیش فەرمانیان پێ بدرێت ئەنجامی دەدەن" پێویستە لە هەر سیفەتێکدا، کە شایەن و لایەقی ئەوان نییە، بەدووربگیرێن.

٧- هاندان لەسەر پاکوخاوێنیی کەسایەتی، چونکە فریشتەکان بەو شتانەی مرۆڤەکان ئازاری پێ دەخۆن، ئەوانیش ئازاری پێ دەخۆن. ئەوەتا (جابر)ی کوڕی (عبدالله) لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە

---

[1] سەیری (تربية الناشئة في القرآن الكريم، صباح الطليان) بکە، (لا ٤٣، ٤٤).

**فەرموویەتی: (هەرکەسێك لەم بەرە بخوات، کە سیرە - جارێکیشیان فەرمووی: هەرکەسێك پیاز و سیر و کەوەر بخوات - با نزیك مزگەوتەکانمان نەبێتەوە، چونکە لەو شتانەی ئادەمیزاد ئازاری پێ دەخوات، فریشتەکانیش ئازاری پێ دەخۆن).**[1]

٨- چەند حیکمەتێك لە بوونی فریشتەکان و باوەڕبوون پێیان هەیە، لەوانە: مرۆڤ زانستفراوانی و پیرۆزی و گەورەیی و توانایی و حیکمەتەکانی خوای گەورە فێر دەبێت" هەروەها: موسڵمان هەست بە پارێزراوی دەکات، چونکە دەزانێت چەند سەربازێك هەن بە فەرمانی خوا دەیپارێزن و سەری دەخەن.[2]

٩- مرۆڤ لە ڕوانگەی پەیوەندیی فریشتەکان پێیەوە لە ڕووی پێکهاتە و چاودێرییەوە، هەست بە گرنگی و بەهای خۆی دەکات، بیرۆکەی بەکەمسەیرکردن و بێبایەخکردنی لە لا نامێنێت، بۆیە ڕێزی خۆی دەگرێت" هەوڵ دەدات ئەو ئەرکە گەورەیە لەسەر شانییەتی جێبەجێی بکات.[3]

---

[1] موسلیم گێڕاویەتییەوە (٥٦٤).

[2] بۆ زانیاریی زیاتر دەکرێت ئەو کتێبانە بخوێنرێنەوە، کە باس لە باوەڕبوون بە فریشتەکان دەکەن، لەوانە: (عالم الملائكة الأبرار، د.عمر الأشقر)، (عالم الملائكة في ضوء السنة النبوية دراسة موضوعية، نبيل ابو العمرين، رسالة ماجستير من جامعة غزة، منشورة على الشبكة)، (أهمية الإيمان بالملائكة وعلاماته النفسية والاجتماعية والخلقية، د. محمود سعدات، شبكة الألوكة).

[3] سەیری (عالم الملائكة الأبرار، د.عمر الأشقر) بکە، (لا ٦).

## پایەی سێیەم: باوەڕبوون بە کتێبە ئاسمانییەکان:

باوەڕبوون بە کتێبە ئاسمانییەکان ئەمانە دەگرێتەوە:

١- باوەڕبوون بە بوونی کتێبێك، کە لە لای خواوە دابەزێنراوە، ئەمەیش لە گەورەترین بەزەییەکانی خوایە بۆ بەندەکانی، بەوپێیەی بۆ هەر نەتەوەیەك بەگوێرەی گونجاویی خۆیان کتێبێکی بە حوکم و یاساوە بۆ دابەزاندوون، بۆ ئەوەی ڕێنوێنی وەربگرن. دەبێت بۆ منداڵ ڕوون بکرێتەوە، کە دابەزینی کتێب بەخششێکی گەورەیە، چونکە هەر ئەو کتێبانەن خوای گەورە و ڕۆژی دوای و چاکە و خراپەیان پێ ناساندووین.

٢- بڕواهێنان بەو ناوانەی فێریان بووین، لەوانە: (صُحف إبراهیم)، (تەورات)، کە بۆ موسا ﷺ دابەزی، (زەبور)، کە بۆ داود ﷺ دابەزی، (ئینجیل)، کە بۆ عیسا ﷺ دابەزی، (قورئانی پیرۆز)یش، کە بۆ موحەممەد ﷺ دابەزی.

٣- سەرجەم ئەم کتێبانەیش یەکتری پشتڕاست دەکەنەوە و یەکتر بەدرۆ ناخەنەوە، هیچ دژیەکییەك و پێچەوانەیەك لە نێوانیاندا نییە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ﴾ المائدة: ٤٨

واتە: "ئێمە قورئانمان هاوڕێ لەگەڵ هەموو حەقیقەت و ڕاستییەکدا بۆ تۆ دابەزاندووە، ڕاستی و دروستی کتێبەکانی پێش خۆیشی دیاری دەکات".

٤- بڕواهێنـان بـەو هەواڵـە دروسـتانەی تێیانـدا هـاتووە، فێـریش بکرێت، کە سەرجەم کتێبە ئاسمانییەکانی پێشوو دەستکاری کراون و زیاد و کەم کراون، چونکە هەموویان کـاتی بـوون و تـەنیا تایبـەت بـوون بـە نەتەوەیەك، خوای گەورە وەك قورئان بەڵێنی پاراسـتنی کتێبـەکانی تـری نەداوە.

٥- بـاوەڕبوون بـەوەی قورئـان هـەموو کتێبـەکانی پـێش خـۆی سڕیونەتەوە، کارکردن بە حوکمەکانی قورئانی پیرۆز ئەرك و واجبـە، تـا ڕۆژی دوایی، بۆیە پێویستە فەرمانەکانی جێبەجێ بکرێن و ڕێگرییەکانی ئەنجام نەدرێت" حەرامەکانی حەرام و حەڵاڵەکای حەڵاڵ بکرێن، کـارکردن بە یاساکانی و تەسلیمبوون پێی، نەبەزاندنی سنوور و ڕێنماییەکانی.[1]

**هەر سەبارەت بە پرسی باوەڕهێنان بە کتێبە ئاسمانییـەکان:** بابـەتی لەبەرکردنی قورئـانی پـیرۆزە لای منـداڵ لـە بچـووکییەوە، چـونکە لـە کاتێکدا لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز بە یەکێك لە گرنگترین چـالاکییەکانی گەشەکردنی زیرەکیی منداڵ دادەنرێت، ئەمە ئەگەر کەسـی پـەروەردەکار سەرکەوتوو بوو لە دروستکردنی کەشێکی گونجاو لە دڵی منداڵدا، قورئان داوامان لێ دەکات بۆ زیادکردنی باوەڕمان و تێکەڵاوبوونی زانست لەگەڵ کردەوە" بیر لە دروستکردنی زەوی و ئاسمانەکان و دروسـتکردنی مـرۆڤ و هەرچی لە دەوروبەرمانە بکەینەوە و لێیـان ڕابمێـنین، بۆیـە لەبـەرکردنی قورئان و تێگەیشتن لە واتاکانی مرۆڤ دەگەیەنێتە قۆناغێکی پێشـکەوتوو

---

[1] بۆ زانیاری زیاتر دەکرێت کتـێبی (الإیمـان بالکتـب)ی شـێخ د.محمـد بـن إبـراهیم الحمـد بخوێندرێتەوە، هەروەها کتێبی (الإیمان بالکتب)ی أحمد نجار.

لە زیرەکی.[1] وێڕای ئەوەی زمانی منداڵ لەسەر خوێندنەوەی دروست و ڕەوانبێژی ڕادێت، ئەمەیش لە ڕێی بەهێزکردنی زمانی بە خوێندنەوەی قورئان و تەجوید. هەروەها هانی منداڵ بدرێت لەسەر کارکردنی بە ڕێنمایی و ئادابەکانی قورئان لە هەموو بوارێکی ژیاندا، ئەوکات منداڵ لەسەر ژیانێکی دروست و ڕەوشتی بەرز پەروەردە دەبێت. هەر لەو سوودانە: بەدەستهێنانی پاداشت و خێرێکی زۆر، لەمیانەی کۆبوونەوەیان لە بنکە و بازنەکانی لەبەرکردندا.[2]

## چۆن منداڵ هان بدەین بۆ لەبەرکردنی قورئان؟

١- گەورەیی و پاداشتی لەبەرکردن و خوێندنەوە و فێربوون و کارکردن بە قورئان بۆ منداڵ ڕوون بکەینەوە، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: **(قورئان بخوێنن، چونکە ڕۆژی دوایی قورئان دەبێتە تکاکار بۆ هاوڕێکەی).**[3] یان دەفەرموێت: **(لە ڕۆژی دواییدا بە هاوڕێی قورئان دەوترێت بیخوێنەرەوە، بەرزببەرەوە، بە وردی و لەسەرخۆیی بیخوێنەرەوە وەك چۆن لە دونیادا دەتخوێندەوە، پێگە و پایەی تۆ لە دوایین ئەو ئایەتەدایە، کە دەیخوێنیتەوە).**[4] یان دەفەرموێت: **(نموونەی ئەو باوەڕدارەی قورئان دەخوێنێت وەك پرتەقاڵە، بۆنی خۆشە و تامی خۆشە،**

---

[1] تعليم التفكير، سيف العيساوي، (لا ١٢١).

[2] (من الآثار الإيمانة لتعليم وتعلم القرآن الكريم على الفرد والمجتمع، د. شعبان مقلد، شبكة الألوككة، ١٤٣٠/٦/١٣)، سەیری (أسس بناء شخصية الطفل المسلم، علي الشحود) بکە، (لا ٤٦).

[3] موسلیم گێڕاویەتییەوە (٨٠٤).

[4] الترمذي گێڕاویەتییەوە، (٢٩١٤)، ئەلبانی بە "حەسەن"ی داناوە.

**نموونەی ئەو باوەڕدارەی قورئان ناخوێنێت وەك خورمایە، هیچ بۆنی نییە، بەڵام تامی خۆشە" نموونەی ئەو دووڕووەی قورئان دەخوێنێت وەك ڕێحانەیە، بۆنی خۆشە بەلام تامی تاڵە، نموونەی ئەو دووڕووەیشی قورئان ناخوێنێت وەك گوژاڵکە، بۆنی نییە و تامیشی تفت و تاڵە).**[1] هەروەها دەفەرموێت: (**باشترینتان ئەو کەسەیە قورئان فێردەبێت و خەڵکیش فێر دەکات).**[2] چەند نموونەیەکی پیاوچاکانی پێشینانی بۆ باس بکە، ئەمەیش لە گەورەترین هۆیەکانی جوڵاندنیەتی بۆ ئەم ئەرکە.[3]

٢- ناوی تۆمار بکەین لە بنکەکانی خوێندنەوە و لەبەرکردنی قورئان، یان دابینکردنی مامۆستایەك فێری قورئانی بکات، بەکارهێنانی شێوازی هاندانی و خەڵات و کەشی پێشبڕکێ لە نێوان منداڵان و قوتابییان.[4]

٣- پێویستە بابەتی لەبەرکردنی قورئان لە لای منداڵ ئاسان بکرێت، بۆ ئەوەی ئارامی لەسەر بگرێت و خۆشی بوێت، باشترە سەرەتا بە جوزئی (عمّ) دەست پێ بکات، چونکە ئایەت و سورەتەکانی کورتن و بۆ جێگیربوونی لە مێشکی منداڵ ئاسانترن[5]" هەروەها هەندێ لە

---

[1] بوخاری گێڕاویەتییەوە، (٥٤٢٧).

[2] بوخاری گێڕاویەتییەوە، (٥٠٢٧).

[3] سەیری (التربیة العقائدیة، د. محمد حاج الجزائري، موقع في طریق الاصلاح) بکە، هەروەها سەیری (منهج التربیة النبویة للطفل، محمد سوید) بکە، (لا ٢٣٨).

[4] بۆ زانینی شوێنەواری حەڵقەکانی لەبەرکردنی قورئان لەسەر کەسایەتیی منداڵ و گەشەکردنی، سەیری کتێبی (دور الحلقات القرآنیة في تنمیة شخصیة الطفل المسلم، عبدالله محمد هنانو) بکە.

[5] سەیری (طفل الابتدائي وطرق تربیته علمیا، معتز شاهید، موقع المسلم تاریخ النشر ١٤٣٢/٧/٧هـ.) بکە.

سورەتەکان پایەکانی ئیمانیان تێدایە، بیروباوەڕ و ڕەفتـار باشـتر دەکـەن، تەنانەت سەلامەتی و تەندروستی منداڵ دەپارێزین. لەوەیش زیاتر قورئان پڕیەتی لە یادکردنی خوای موتەعال و نزاکردن، کە زمان پاراو دەکـات و ڕەوانبێژی زیاد دەکات.

٤- لە کاتی خوێندنەوەی و لەبەرکردنی، گرنگی بدرێت بە شـرۆڤەی کورتی قورئان، بۆ ئەوەی دەرگای واتای ئایەتەکان بەسەر دڵ و مێشـکیدا بکرێنەوە. با کەس وا گومان نەبات، کە منداڵی بچووك شایەنی شرۆڤەی قورئـان نییـە، بـەڵکو منـداڵ خـاوەنی توانایـەکی سەرسـووڕهێنەرە لـە تێگەیشتن و لەبەرکردن.[1]

٥- فێری بکەین کە قورئـان شـیفا و میهرەبـانی و بەرەکەتـە، وەك پـــــەروەردگار دەفـــــەرموێت: ﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴾ الإسراء: ٨٢

واتە: "ئێمە لە قورئانـدا ئایـەت و سـوورەتگەلێك دادەبـەزێنین، کـە ببێتە هۆی شیفا و چارەسەر بۆ نەخۆشییە دەروونی و جەسـتەییەکان، هەروەها ڕەحمەت و میهرەبانییش بۆ ئیمانـداران"، بۆیـە هەرکەسـێك لەبـەری بکـات، یـان بەشـێکی لەبـەر بکـات، دەتوانێـت خـۆی و دەوروبەرەکەی پێ چارەسەر بکات لە کاتێ نەخۆش کەوتندا.

---

[1] سەیری (التربية العقائدية، د. محمد حاج الجزائري، موقع طريق الإصلاح) بکە، هـەروەها سەیری (مهارات تحبيب أطفالنا في القرآن، آمنـة محمـد) بکـە، گۆڤـاری (الـوعي الإسـلامي ژمارە ٥٥٦) و (منهج التربية النبوية للطفل، محمد سويد) بکە، (لا ٢٣٢).

## پایەی چوارەم: باوەڕبوون بە پێغەمبەران

باوەڕبوون بە پێغەمبەران (سڵاوی خوایان لەسەر بێت) ئەم شتانە دەگرێتەوە: باوەڕبوون بە ڕاستگۆییان و ئەو هەواڵە ڕاستانەی لەوانەوە هاتوون، ئەو ناوانەی فێریان بووین، خوای گەورە بەهۆی جیاوازی ڕەوشتبەرزی و عەقڵمەندییان لەناو نەتەوەکانی خۆیان هەڵیبژاردوون، بۆ ئەوەی پەیامەکەی بگەیەنن" وەك دەفەرموێت: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوۡمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمۡۖ ﴾ إبراهيم: ٤

واتە: "ئێمە هیچ پێغەمبەرێکمان ڕەوانە نەکردووە، تەنیا بە زمانی قەومەکەی نەبێت، تا هەموو شتێکیان بۆ ڕوون بکاتەوە"، چونکە ئەگەر پێغەمبەر، فریشتە بوایە کەس لێی تێنەدەگەیشت. پێویستە لەسەرمان جیاوازی لە نێوان هیچ یەك لە پێغەمبەران نەکەین، نەك ئەوەی باوەڕ بە هەندێکیان بکەین و باوەڕ بە هەندێکی دیکەیان نەکەین، بەڵکو دەبێت باوەڕ بە هەموویان بکەین. سەرجەمیان لە پەیامەکانیاندا ڕاستگۆ بوون، هەروەك چۆن لە ئامۆژگاریی نەتەوەکانیاندا چاکەکار بوون، لە گەیاندنی پەیامی خوای گەورەیشدا بێتاوان و بێ هەڵەبوون. ناکرێت کار بە شەریعەتەکەیان بکەین، جگە لە شەریعەتی دوا پێغەمبەر، محمد ﷺ.[1]

**لە واتا پەروەردەییەکان تایبەت بە باوەڕهێنان بە پێغەمبەران ئەمانەن:**

---

[1] بۆ زانیاری زیاتر دەکرێت کتێبی (الرسل والرسالات) د. عمر الاشقر بخوێنرێتەوە، هەروەها کتێبی (المباحث العقدية بالإيمان بالرسل، أحمد النجار) و کتێبی (الإيمان بالرسل والرسالات، د. علي الصلابي).

١- ڕوونــی بکەینــەوە، کــە خــوای گــەورە بــۆ هــەموو نەتەوەیــەك پێغەمبەرێکی لە خۆیان ڕەوانە کردووە، بانگهێشتیان دەکات بۆ پەرستنی خوای تــاك و تــەنیا و ڕەتکردنــەوەی پەرســتراوەکانی تــر، هەموویشــیان ڕاستگۆ و چاکەکار و ڕێنوێنیکار و پارێزکار و لەخواترس بوون.

٢- ڕوونی بکەینەوە، کە پەیامی یەکــەم پێغەمبــەر لەگــەڵ دوایــن پێغەمبــەر لەســەر بنــەمای پەرســتن هــاوڕان، ئــەویش بریتییــە لــە یەکتاپەرستی بە بیروباوەڕ و کردەوە و گوفتار، پەرستراوەکانی تریش ڕەت بکرێنەوە.

٣- حیکمەتە خواییەکان لە نــاردنی پێغەمبــەران بــۆ خــەڵك، ڕوون بکەینەوە، لەوانە پەرســتنی خــوای پــەروەردگار ﷻ بــە یەکتاپەرســتی، ڕێنوێنیکردنی خەڵك و ئاراستەکردنیان بــۆ ڕێگــەی دروســت، فێرکردنــی خەڵك بە کاروباری دونیا و دواڕۆژیان و دەرهێنانیــان لــە تــاریکی بــەرەو ڕووناکی، ڕابەرایەتیی ئوممەت و جێبەجێکردنی شەرعی خــوا لەنێویانــدا“ هەروەها دەستگرتن بە بەرنامەکەیان و ڕۆیشتن لەسەر ڕێبازەکەیان.

٤- زانــینی ســۆز و میهرەبــانی خــوای گــەورە لــە گرنگیــدان بــە بەندەکانی، بەو پێیەی پێغەمبەرانی بۆ ڕەوانــە کــردوون، تــا بــۆ ڕێگــەی ڕاست ڕێنوێنییان بکات، ئاگاداربوون لەسەر سوپاسکردنی ئەم بەخششــە گەورەیــە“ هــەروەها خۆشویســتنی پێغەمبــەران، چــونکە هەڵســاون بــە گەیاندنی پەیام و ئامۆژگاری بۆ بەندەکان. مرۆڤ با خاوەنی عەقڵ و ژیری بێت، ناتوانێت بەو عەقڵ و ژیرییە بەرژەوەندیی ئوممەت بەبێ کــەموکوڕی ڕێکبخات و بیانکات بە ئوممەتێکی یەکگرتوو و یەکسان لە پێدانی مــاف بە هەموو خاوەن مافێك، بۆیە ئەوە پێغەمبەرانن (سڵاوی خوایان لەســەر

بێت) مرۆڤـه‌كان فێـری ئـه‌و شـتانه ده‌كـه‌ن، كـه سـوودیان هه‌یـه و لـه زیانه‌كانیش ڕێگرییان لێ ده‌كه‌ن.[١]

٥- چاندنی خۆشه‌ویستیی پێغه‌مبـه‌ری خـوا ﷺ لـه‌ناو دڵمـان، بـۆ ئه‌وه‌ی بتوانین ملكه‌چی بین و له‌سه‌ر ڕێبازه‌كه‌ی بڕۆین و به گه‌وره‌ی بزانین، خۆشه‌ویستیی هیچ كه‌سـێكیش نه‌خه‌ینـه پـێش خۆشه‌ویسـتیی ئـه‌وه‌وه، لایه‌نگیری و پشتیوانیی هه‌ركه‌سێك بكه‌ین، كه لایه‌نگیری و پشـتیوانیی پێغه‌مبـه‌ری خـوا ﷺ ده‌كـات" دژایـه‌تی هه‌ركه‌سـێكیش بكـه‌ین، كـه دژایه‌تیی ده‌كات.[٢] هه‌روه‌ها ڕێزداركردنی ناوی، بـه‌وه‌ی هـه‌ركات نـاوی هات سه‌ڵاواتی له‌سه‌ر لێبدرێت، ڕه‌وشت و ڕه‌فتـاری بـه پـیرۆز دابنرێـت، چونكه پێغه‌مبـه‌ر ﷺ ئێجگـار بـه بـه‌زه‌یی و میهره‌بانـه.[٣] هـه‌روه‌ها ڕێزگرتنی پێغه‌مبه‌ری خـوا ﷺ لـه لای گۆڕه‌كـه‌ی و لـه مزگه‌وته‌كـه‌ی، ئه‌ویش به به‌رزنه‌كردنه‌وه‌ی ده‌نـگ له‌سـه‌ری، چـونكه خـوای گـه‌وره بـه سه‌ردانیكردنی گۆڕه‌كه‌ی ڕێزی له‌و پێغه‌مبه‌ره ﷺ گرتـووه و شه‌ره‌فیشـی به وه‌ستان له‌سه‌ر گۆڕه‌كه‌ی پێداوه.[٤]

---

[١] سه‌یری (مجموع فتاوي ورسائل الشيخ محمد بن صالح العثيمن) بكه، (لا ١٤٥).

[٢] سـه‌یری (دور الأنشـطة غـير الصـفية في تنميـة حـب الـنبيﷺ لـدى اتلميـذات المرحلـة الابتدائية، فوزية البقمي) بكه، (لا ٩٢، ٩٨، ٩٩).

[٣] ده‌كرێت سوود له كتێبی (عنايـة الرسـول ﷺ بـالمرأة والطفـل)ی محمـد مسـعدی يـاقوت وه‌ربگرێت، هه‌روه‌ها توێژینه‌وه‌ی (رحمة الرسول ﷺ بالحيوانات والطير) د. حذيفة السامرائي.

[٤] سه‌یری (حقيقـة الإيمـان بالرسـل، محمـد المنجـد، الإسـلام سـؤال وجـواب) بكـه، میـژووی بڵاوكردنه‌وه: ٢١/١/٢٠٠٢م.

## چۆن منداڵ فێرە خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ بکەین:

١- پێویستە دڵنیابین لەوەی، کە خوای پەروەردگار پێغەمبەرەکەی ﷺ خۆش دەوێت، بەسەر هەموو خەڵێکدا هەڵیبژاردووە و چاکە و فەزڵی پێداوە، خۆشویستنیی لەسەرمان واجب کردووە" دەبێت ئەوەیش بزانین خۆشەویستیی پێغەمبەر ﷺ نیشانەی خۆشەویستیی خوای گەورەیە، هەرکەسێکیش پێغەمبەری ﷺ خۆش بوێت، ئەوە بەدڵنیایی و ڕاستگۆییەوە خوای خۆش ویستووە.[1]

٢- بیرهێنانەوەی ئەوەی، کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە هیدایەتەکەی و گەیاندنی ئایینەکەی، ڕەحمەت و بەرەکەتە بۆ هەموو جیهانییان، لە ڕۆژی دواییشدا بە ڕەحمەت و بەرەکەتەکەی دەبێتە تکاکار بۆ بڕواداران.

٣- خوێندنەوەی چەند بەشێك لە ژیاننامە پڕ گوڵاوەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ منداڵ، ئینجا منداڵ تێدەگات، کە پێغەمبەر ﷺ پێشەنگ و نموونەی باڵایە بۆ هەموو مرۆڤایەتی. لێرەدا پێویستە باسی هەریەکە لە موعجیزەکانی و ڕەوشتبەرزییەکەی و سەرخستنی ستەملێکراوان و سۆز و بەزەیی بەسەر هەژاران و وەسییەتی بۆ بێباوکان و میهرەبانی بۆ کەسانی بێهێز بکرێت[2]، لە هەموویشی گرنگتر ئەوەیە، کە زمانمان نزیك بێت لە ئاستی گەشەی منداڵ، تەنیا ئەو بابەتانە باس

---

[1] سەیری (دور الأنشطة غير الصفية في تنمية حب النبي ﷺ لدى تلميذات المركة الابتدائية، فوزية البقمي) بکە، (لا ٨٤).

[2] دەکرێت سود لە کتێبی (کيف عاملهم)، نووسینی محمد المنجد ببینرێت، (لا ٣٠١، ٦٩١، ٧٦١)، یاخود کتێبی (الرحمه فی حياه الرسول)ی راغب السرجانی (لا ٦٥).

بکرێن، کە گونجاون لەگەڵ ئاستی عەقڵیدا" ئەمەیش بۆ ئەوەی بەجوانی وەربیگرێت. هەروەها دەبێت سووربین لەسەر ئەوەی هۆیەکانی نمایشی ئەم بابەتە هەمەجۆربن و بگونجێن لەگەڵ تەمەنی منداڵدا، بە ڕەوچاوکردنی جیاتاکی و بارودۆخی ژینگەیی.[1]

٤- وا باشە منداڵ لە ژینگەیەکدا دایك و باوك و دەوروبەری خۆی ببینێت، کە پێغەمبەری خوا ﷺ و سوننەتەکەی بە گەورە دەزانن. سووربوون لەسەر دەستگرتن بە ڕێبازەکەی و سەڵاوات لێدان لەسەری هەرکات ناوی بێت. ڕەفتاری دایك و باوك لە گەورەترین کاریگەرییەکانی پەروەردەیە لەسەر منداڵ، کاتێك دایك، یان باوك بۆ نموونە نوێژی سوننەت دەکات و ئینجا پێی دەڵێت پێغەمبەر ﷺ بەم شێوەیەی کردووە" ئەم شێوازە پەروەردەکردنە بە شێوەی ڕابەرایەتی گەورەترین کاریگەری لەسەر گەشەکردن و پەروەردەی عەقیدەیی دروست دەکات، چونکە پێغەمبەر ڕابەر و نموونەی باڵایە و پێویستە پەروەردەکاران بیکەنە پێشەنگی خۆیان و دەست بە هیدایەتەکەی و سوننەتەکەیەوە بگرن و بە شێوەی کرداری لەگەڵ منداڵەکانیاندا لەسەر ئەرزی واقیع جێبەجێی بکەن.[2]

٥- لەبەرکردنی هەندێ فەرموودەی سەحیح لە لای منداڵ، کە

---

[1] (تعامل الرسول مع الأطفال تربوياً، د.حصة الغصير)، (لا ٧٥، ٧٧)، هەروەها دەکرێت سوود لە کتێبی (الأطلس التاريخي لسيرة الرسول ﷺ، سامي المغلوث)، ببینرێت (لا ١٩٩).

[2] (تربية الناشئة في القرآن الكريم، صباح الطليان)، (لا ٤٤ ٥٩)، سەیری (منهج التربية النبوية للطفل، محمد سويد) بکە، (لا ٢١٩)، هەروەها سەیری (أسس بناء شخصية الطفل المسلم، علي الشحود) بکە، (لا ٢٢). سەیری (دور الأنشطة غير الصفية في تنمية حب النبي ﷺ لدى تلميذات المركة الابتدائية، فوزية البقمي،) بکە، (لا ٨٨).

بەڵگەن لەسەر جوانییەکانی ئیسلام و ڕەوشتبەرزیی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی، فەرموودەکان کاریگەریی گەورەیان لەسەر ئیمان و ڕەفتار و بنیادنانی دەروون هەیە.[1] دەکرێت پێشبڕکێ بۆ لەبەرکردنی فەرموودەی کورت و واتاڕوون ساز بکرێت، ئەو فەرموودانەی هەڵگری ڕەوشتبەرزین بۆ منداڵان، ڕەچاوی شێوازی هاندان بکرێت لە نموونەی دیاری و خەڵات و پاداشت پێدان.

٦- باسکردنی چیرۆکی مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هاوەڵانی و خۆشەویستییان بۆ ئەو، بەتایبەت چیرۆکی منداڵە هاوەڵەکان، بۆ نموونە: ئەنەس () لە توند دەستگرتنی بە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، کە دەگێڕێتەوە جارێك بەرگدوورێك بانگهێشتی پێغەمبەری ﷺ کرد بۆ خواردنێك، کە خۆی دروستی کردبوو، ئەنەس دەڵێت: "لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەو خواردنە چووم، نانێکی دروستکراو لە جۆیان هێنا بۆ پێغەمبەر، لەگەڵ شلەیەك، کە کولەکە و گۆشتی تێدا بوو، بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ بە دوای کولەکەدا دەگەڕا لەسەر قاپەکە، لەو ڕۆژە بەدواوە من بەردەوام حەزم لە کولەکەیە".

(ثمامة) لە ئەنەسەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: "لە بەردەمیدا کولەکەم کۆدەکردەوە".[2] لێرەدا کەسی پەروەردەکار دەبێت سووربێت لەسەر نیشاندانی چۆنێتیی خۆشویستنی هاوەڵان ﷺ بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ

[1] سەیری (الطفل في الشريعة الإسلامية ومنهج التربية النبوية)ی سهام جبار بکە، (لا ٢٥٢).

[2] بوخاری گێڕاویەتییەوە (٥٤٣٩).

و قوربانیدان لە ڕێگەیدا، گێڕانەوەی چیرۆكی كاریگەر لەم ڕووەوە.[1]

٧- فێركردنی شوێنەواری ئەم خۆشەویستییە، بۆ نموونە: لە فەرموودە، كە ئەنەس ﷺ دەیگێڕێتەوە، هاتووە: "پیاوێك پرسیاری ڕۆژی دوایی لە پێغەمبەر ﷺ كرد، وتی: كەی ڕۆژی دواییە؟ ئەویش فەرمووی: (**چیت بۆ ئامادەكردووە؟**)، پیاوەكە وتی: هیچ، تەنیا ئەوە نەبێت، كە خوای گەورە و پێغەمبەرەكەیم ﷺ خۆش دەوێت. پێغەمبەر فەرمووی: (**تۆ لەگەڵ ئەو كەسەدایت، كە خۆشت دەوێت**). ئەنس دەڵێت: لە هەموو ژیانماندا هێندەی دڵخۆشبوونمان بەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ: (تۆ لەگەڵ ئەو كەسەدایت، كە خۆشت دەوێت)، دڵخۆش نەبووین. ئەنەس دەڵێت: من پێغەمبەر ﷺ و ئەبوبەكر و عومەرم خۆش دەوێت، ئومێدم وایە بەم خۆشەویستییەم لەگەڵیان بم، گەرچی من وەك ئەوان كردەوەی چاكەم ئەنجام نەداوە".[2]

٨- یارمەتیی منداڵ بدرێت لە داهێنان و بەرهەم نووسین، كە تایبەت بێت بە خۆشویستنی پێغەمبەر ﷺ، لە نموونەی نووسینی شیعر و چیرۆك و وتار و بابەت نووسین" هەروەها هاندانی پێشبڕكێی جۆراوجۆر لە بابەت خۆشەویستیی پێغەمبەر ﷺ.[3]

---

[1] سەیری (أعظم إنسان عرفته البشرية، هشام برغث) بكە، (لا ١٥٢). هەروەها سەیری (خمسون موقفا للنبي ﷺ مع الصغار، د. إبراهيم الودعان) بكە، (لا ١٩).

[2] بوخاری گێڕاویەتییەوە (٣٦٨٨).

[3] سەیری (التربية العقائدية، د.محمد حاج الجزائري) بكە، ماڵپەری (طريق الإصلاح)، هەروەها (كيف أرسخ حب النبي في قلب ولدي، خالد روشة) ماڵپەری (صيد الفوائد)، هەروەها سەیری (أطفالنا وحب الرسول ﷺ، د.أماني الرمادي) بكە لە ماڵپەری (صيد الفوائد). سەیری (اعظم إنسان عرفته البشرية، هشام برغش) بكە، (لا ١٥١).

## پایەی پێنجەم: باوەڕبوون بە ڕۆژی دوایی

باوەڕبوون بە ڕۆژی دوایی ئەمانە دەگرێتەوە: باوەڕ بە مردن، زیندووبوونەوە، پاداشت، سزا، سیرات" تەرازوو، بەهەشت و ئاگر. منداڵ لە دوای تەمەنی پێگەیشتن (دوای حەوت ساڵان) بە شێوەیەکی ڕوون هەست بە هەندێ بابەتی ڕۆژی دوایی دەکات، بەڵام پێش ئەو تەمەنە باشتر وایە قسەکردن لەسەری بە کورتبڕی و پوختەکراوی بێت. بۆی ڕوون دەکەینەوە، کە ژیانێکی تر هەیە، خوای گەورە بەهەشتی وەك پاداشت بۆ باوەڕداران و ئاگریشی بۆ بێباوەڕان دروست کردووە.[1]

**هەندێ لە واتا پەروەردەییەکان، کە پێویستە لە هەمبەر باوەڕبوون بە ڕۆژی دوایی لە مێشکی منداڵدا بچەسپێنرێن، ئەمانەن:**

١- پێویستە منداڵ بزانێت، کە خوای مەزن لە ڕۆژی دواییدا دوای مردنیان، زیندوویان دەکاتەوە، بۆ ئەوەی پاداشتی کردەوەکانی دونیایان وەربگرنەوە، ئینجا پاداشت بە چاکە و سزایش بە خراپە.

٢- بزانێت، کە خوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا بەهەشتی کردووە بە ماڵی سەربەرزی و بەختەوەری و نەمری، بۆ پاداشتدانەوەی باوەڕدان دروستی کردووە، لە بەرامبەردا ئاگری بۆ سزادانی بێباوەڕان دروست کردووە. دەکرێت خۆشییەکان و بەخششەکانی بەهەشت لای منداڵ خۆشەویست بکرێن.

٣- قسەکردن لەگەڵ منداڵ لەبارەی مردن و ڕۆژی دواییەوە بە

[1] سەیری (غرس أصول الإيمان في نفس الطفل، د. شريفة الحازمي) بکە، ( لا ١٢٤).

شێوازێکی نەرم و جوان، کە بەڵگە بێت لەسەر میهرەبانی و بەزەیی و لێخۆشبوون و نەرمونیانیی خوای گەورە، نەوەك بیرۆکەی بێزارکەر باڵ بەسەر منداڵدا بکێشێت.[1] دەکرێت ئەم بابەتە ببەسترێتەوە بە ژیانی بوونەوەری زیندوو، کە بە هەمان قۆناغدا تێپەڕ دەبێت، بەڵام خوای گەورە مرۆڤی بەوە جیاکردۆتەوە، کە بەرپرسیارێتیی پێداوە و سەرجەم بوونەرەکانی تری خستوونەتە خزمەتی و بەڵێنی پاداشتدانەوەیشی پێداوە.

٤- ڕوون بکرێتەوە، کە خوای گەورە ستەم ناکات، بواریش بە ستەمکار بەبێ سزادان و بە ستەملێکراویش بەبێ مافپێدان نادات، کەسی چاکەکاریش بەبێ پاداشتی چاکە بەجێناهێڵێت. ئێمە لە دونیادا دەبینین، کە هەندێ کەس ستەمکار و زۆردارن و لەسەر ئەو ستەمکاریەیش دەمرن، بۆیە دەبێت ژیانێکی تری جگە لەم ژیانە هەبێت، تا چاکەکار پاداشتی چاکە و خراپەکاریش سزای خراپەکەی وەربگرێتەوە.[2]

## پایەی شەشەم باوەڕبوون بە قەدەر (چارەنووس).

باوەڕبوون بە چارەنووس و قەدەر ئەمانە دەگرێتەوە: باوەڕبوون بە زانستی کاملی پەروەدگار و باوەڕبوون بە کتێب و قەدەر و دروستکراوەکان و ویست و ئیرادەی ئەو زاتە. منداڵ لە تەمەنی بچووکیدا

[1] سەیری (المربون وتساؤلات الأطفال، نوال الخليفة) بکە، (لا ١١٩-١٢١).

[2] بۆ زانیاریی زیاتر دەکرێت ئەم کتێبە بخوێنرێتەوە (الإيمان باليوم الآخر، د. محمد الحمد)، هەروەها کتێبی (الإيمان باليوم الآخر واثره في حياة المسلم)ی عبدالله الأثري.

ناتوانێت لە واتای قەدەر تێبگات، هەندێکیش پێیانوایە ناکرێت منداڵ لە واتاکانی تێبگات، تا نەگاتە تەمەنی نزیکەی نۆ ساڵان[1]، **بەڵام کۆمەڵێك واتای پەروەردەیی هەن پێویستە لە بابەتی باوەڕبوون بە (قەزا و قەدەر)دا بچەسپێنرێن، لەوانە:**

١- باشترین قسەکردن لەسەر ئەم بەشە، ئەو فەرموودەیەیە، کە (ابن عباس) دەیگێڕێتەوە... (عبداللە)ی کوڕی (عباس) ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ڕۆژێکیان لە پشتکەی پێغەمبەر ﷺ لەسەر پشتی وڵاخ دانیشتبووم، پێی فەرمووم: **(يا غلام، إني أُعلّمك كلمات، احفظ اللهَ يَحفظك، احفظِ اللهَ تجدهُ تجاهك: إذا سألتَ فاسأل اللهَ، وإذا استَعْنتَ فاستَعِن بالله، واعلمْ أنّ الأمة لو اجتمعَتْ على أن ينفعُوك بِشَيء، لم ينفعوك إلا بِشيءٍ قَد كتَبه الله لك، وإن اجتمعوا على أن يضرّوك بشيء، لم يضرّوك إلا بشيءٍ قد كتبُه اللهُ عليك، رُفِعَت الأقلام وجُفت الصحف).**[2]

واتە: "ئەی لاو! چەند وشەیەکت فێر دەکەم، (سنوور و ئایین)ی خوای گەورە بپارێزە، دەتپارێزێت، (سنوور و ئایین)ی خوای گەورە بپارێزە، (لە کاتی پێویستی و تەنگانەدا) لە بەردەمی خۆتدا دەیبینیت. ئەگەر نزات کرد و پاڕایتەوە، هەر لە خوا بپاڕێیەوە، ئەگەر داوای هاوکاری و پشتیوانیت کرد، هەر لە خوا داوا بکە. ئەوەیش بزانە، گەر هەموو خەڵك کۆببنەوە بۆ ئەوەی سوودێکت پێ بگەیەنن، هیچ سوودێکت پێ ناگەیەنن مەگەر خوای گەورە بۆی نووسیبیت، ئەگەر هەموو

[1] سەیری (غرس أصول الإيمان في نفس الطفل، د.شريفة الحازمي) بکە، (لا ١٢٨).
[2] الترمذي گێڕاویەتییەوە (٢٥١٦).

خەڵکیش کۆببنەوە بۆ ئەوەی زیانێکت پێ بگەیەنن، هیچ زیانێکت پێ ناگەیەنن مەگەر خوای گەورە بۆی نووسیبیت. قەڵەم هەڵگیراوە و پەڕەکانیش وشك بوونەتەوە". لە گێڕانەوەیەکی تردا دەفەرموێت: **"خوای گەورە بپارێزە، لە بەرامبەر خۆتدا دەیبینییەوە، خوای گەورە لە خۆشی و ئارامیدا بناسە، ئەویش لە کاتی تەنگانەدا دەتناسێت و بەهاناتەوە دێت" بزانە هەر شتێکت تووش نەبووبێت، یان بەدەستت نەهێنابێت، دیارە بۆ تۆ نەبووە، هەرشتێکیشت بەدەست هێنابێت و تووشت بووبێت، دیارە بۆ تۆ بووە. بزانە بێگومان سەرکەوتن لەگەڵ ئارامگرتندایە، خۆشی لەگەڵ ناخۆشیدایە، هاوڕێ لەگەڵ تەنگانەدا خۆشی و ئاسوودەیی دێت".**[1] ئەم فەرمووده پیرۆزانە بە کانیاوێکی پەروەردەیی دادەنرێن، کە ڕێنمایی جوانیان لە لایەن پێغەمبەرەوە ﷺ بۆ ئۆممەتەکەی لێ هەڵدەقوڵێت، تایبەت بە پەروەردەکردنی ڕۆڵەکان لەسەر بیروباوەڕی دروست.[2]

٢- باشترین شتی ئەم بابەتە لای منداڵ لە تەمەنی بچووکیدا ئەوەیە، کە لە پرسی چارەنووس (قەزا و قەدەر)دا قووڵ نەبینەوە، ئەوەی تەنیا دەکرێت منداڵ لەم قۆناغە تێبگەیەنرێت ئەمەیە: ڕوونکردنەوەی بابەتی زانستفراوانیی پێشوەختەی خوای پەروەردگار بە قەدەر و ئاگاداربوون و ویستی ئەو زاتە، هاوڕێ لەگەڵ چەسپاندنی بابەتی ئازادیی مرۆڤ و بەرپرسیارێتیی تەواوی بەرامبەر کردەوە ویستراوەکانی" هەروەها

---

[1] ئەحمد گێڕاویەتییەوە (٢٨٠٣).

[2] سەیری (تربية الناشئة في القرآن الكريم، صباح الطليان) بکە، (لا ٢٣)، هەروەها سەیری (احفظ الله يحفظك، محمد الدبيسي) بکە، (لا ٢٥٣). هەروەها سەیری (خمسون مقوفا للنبي ﷺ مع الصغار، د.إبراهيم الودعان) بکە، (لا ٢٥).

شایەنبوونی بە پاداشت و سزا لەسەر کردەوەکانی.. بەڵام، ئەگەر زانرا ئەم بابەتە مێشکی منداڵ سەرقاڵ دەکات و کۆنترۆڵی پێ ناکرێت، پێویستە لەسەر پەروەردەکار بە وێنەی ئاسانکراو، کە عەقڵی لێی تێبگات، بابەتەکە روون بکاتەوە.

٣- پەروەردەکردنی منداڵ لەسەر داواکردن و نزاکردن لە خوای پەروەردگار، جگە لەو داوا لە کەسی تر نەکات، پشت بەو ببەستێت، فێری پشتبەستن بە خوا و خۆدانەدەستی ئەو بکرێت" هەروەها فێری ئارامگرتن بکرێت لەسەر قەزا و قەدەری خوا.

٤- منداڵ فێر بکرێت، کە خوای گەورە جگە لە چاکە هیچی تری ناوێت. منداڵ لەو ژیانەدا لەسەر وادەی خۆیەتی لەگەڵ قەدەرەکانی خوا، بۆیە بەدڵنیاییەوە دڵ و دەروونی تەنگ نابێت و ناترسێت، بە دڵ و دەروونێکی ڕەزامەندانەوە بە قەدەری خوا لە بەرامبەر ناخۆشییەکاندا دەوەستێتەوە، چونکە دڵنیایە لەوەی، کە: ﴿ قُل لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا هُوَ مَوْلَىٰنَا ﴾ التوبة: ٥١

واتە: "(ئەی پێغەمبەر!) بڵێ: هەرگیز لەوە زیاترمان بۆ پێش نایەت و تووشمان نابێت، جگە لەوەی، کە خوا بۆی نووسیووین، ئەو زاتە هەمیشە یار و یاوەر و پشتیوانمانە".

٥- بزانێت، کە هەموو کاروبارێك بە دەستی پەروەردگارە، هەر ئەو پاك و بێگەردەیە چیی بوێت دەیکات و هەڵیدەبژێرت، چونکە هەڵسوکەوتی ڕەهایە لە موڵکی خۆیدا" ئەم کارەیش وا دەکات زیاتر ببەسترێتەوە بە خالیقی خۆیەوە و بەرەو رووی بڕوات، لە پاشان بەستنەوەی ئومێد و هیواکانی بەو زاتەوە.

٦- بڕواهێنان بەم پایە، هاوسەنگی و دڵنیایی لە دەروونی منداڵدا دەهێنێتەدی، هەرکات بڕوادار هەست بکات هەرچی تووشی دەبێت لە خراپە و چاکە هەر بە خێر بۆی دەنووسرێت، هیچ خراپەیەکی ڕەها بوونی نییە" ئینجا هەست بە ئارامی و سەقامگیریی دەروونی دەکات، وا دەکات بە دڵفراوانی بەرامبەر کێشە و ماندووبوون و خەم و خەفەتەکانی بوەستێتەوە، لە پاشان خۆی تەسلیمی خوای گەورە دەکات و بە دڵی ئارام و ئاسوودەوە دەژیی.[1] هەرکەسێك بڕوای بە قەدەری خوای پاك و بێگەر هەبێت، نە دەترسێت و نە دەشڵەژێت، لە کاتی بەلا و نەهامەتییشدا تووڕە نابێت، بەڵکو مل کەچ دەکات بۆ قەدەری پەروەردگار و چاوەڕێی پاداشتیش لەو دەکات، لەگەڵ یەکەم بەریەککەوتن ئەو فەرمایشتەی خوای گەورەی بە بیردا دێت، کە دەفەرموێت: ﴿ وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٥﴾ ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةٞ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ﴿١٥٦﴾ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ صَلَوَٰتٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَرَحۡمَةٞۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُهۡتَدُونَ ﴾ البقرة: ١٥٥ – ١٥٧

واتە: "مژدە بدە بەو کەسانەی خۆگر و ئارامگرن، کە ئەوانەن هەرکاتێك تووشی بەلاو ناخۆشییەك دەبن، دەڵێن: ئێمە موڵکی خواین و هەرچی هەمانە بەخششی خوایە، سەر ئەنجامیش تەنیا هەر بۆ لای ئەو زاتەیە گەڕانەوەمان.. ئا ئەوانە چەندان ستاییش و ڕەحمەت و میهرەبانی بەسەریاندا دەبارێت لە لایەن پەروەردگاریانەوە و ئەوانە ئەو کەسانەن ڕێبازی هیدایەتیان وەرگرتووە".

٧- دەکرێت سوود لە گێڕانەوەی هەندێ چیرۆك و بەسەرهات

---

[1] سەیری (الطفل في الشريعة الإسلامية ومنه التربية النبوية، سهام جبار) بکە، (لا ٢٤٩).

ببینرێت، کە خاوەنەکانیان لە سەرەتادا بەرامبەر تووشبوونیان بە قەدەری خـوا دڵتـەنگ بـوون، بـەڵام دوای دەرکـەوتنی خێـر و چـاکە لـە دوای قەدەرەکە، بارودۆخ و گوزەرانیان بەرەو باشە گۆڕانی بەسەردا هاتووە.

٨- باوەڕبوون بە قەدەر هەر لە خودی باوەڕبوون بە خـوای گـەورەدا کورت دەکرێتەوە، کە ئەو زاتە بە زانستی پێشوەختەی خـۆی زانایـە بـە وردەکـاریی هـەموو شـتێك، ئەنـدازە و پێوانـەی هـەموو شـتە دروستکراوەکانی، تا ڕۆژی دوایی لە تـابلۆی پـیرۆز (اللحـوح المحفـوظ)دا پاراستووە" هیچ ڕووداوێك لە بونەوەر و دروستکراوەکانیدا بـەبێ ویسـتی ئەو ڕوونادات.

## دەروازەی وەڵامەکان

خوای پەروەردگار ﷻ منداڵی لەسەر حەزی پرسیارکردن بەدیهێناوە، بۆ ئەوەی عەقڵی بە زۆرترین زانیاری و تێگەیشـتن پـڕ بکرێـت، قۆنـاغی منداڵی بە قۆناغی پرسـیارکردن دادەنرێـت، بەوپێیـەی زۆرتـرین قسـەی منداڵ لەم قۆناغەدا بریتییە لە پرسیارکردن[١]" منداڵ هەست دەکات لـەو شتانەی دەوروبەری هیچ تێ ناگات.. لەبەر ئـەوەی نـەزانین تـرس لەگـەڵ خۆی دەهێنێت، بۆیە منداڵ بۆ زانینی هەموو شتێکی نوێ تێدەکۆشـێت، دەبینین منداڵی سێ ساڵان، ڕۆژانە بە چەندان پرسیار ڕووبـەڕووی دایـك و بـاوك و بـرا و خوشـکەکانی دەبێتـەوە، بێگومـانیش وەڵامـەکانیان کاریگەرییان دەبێت لەسەری" لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێکی دیکەی دەبەن، کە

---

[١] سەیری (تأسیس عقلیة الطفل، د. عبدالکریم بکار) بکە، (لا ١٠).

شێوازی پرسیارەکان بە بەردەوامی گۆڕانی بەسەردا دێت.[1] بەردەوام گوێت لە وشەکانی (بۆچی؟)، (لە کوێیە؟)، (چیی لێ هات؟)، (لە کوێ هات؟)، (ئەمە چییە؟)، (دەزانیت؟) و...هتد، دەبێت لە منداڵەوە" دەیەوێت زانیاری لەبارەی هەرشتێکەوە بزانێت، کە سەرنجی ڕادەکێشێت و دەیانبینێت و دەیانبیستێت، لەوانەیە لە وەڵامەکان تێبگات، لەوانەیشە تێنەگات، هەندێ جار بۆ ماوەیەك بە بێدەنگی گوێ بۆ وەڵامەکان هەڵدەخات، لەوانەیشە گوێیان بۆ نەگرێت.[2]

منداڵ بە حەزی گەڕان دەناسرێت، لەوانەیە ئەو حەزە بەگوێرەی ئەو ژینگەیەی لێی دەژی و بە پێی ئەو هەلەی بۆی دێتە پێش زیاد بکات، بۆیە گەر بەراوردێك لە نێوان پرسیارەکانی سەردەمی منداڵیی خۆمان و پرسیارەکانی ئەمڕۆی منداڵان بکەین چاومان لە بەرامبەریاندا ئەبڵەق دەبن، ئەمەیش بەهۆی جیاوازیی کات و شوێن و پێشکەوتنی زانستەوەیە. گومانیشی تێدا نییە ئەو شێوازەی پەروەردەکاران پەیڕەوی دەکەن، بە شێوەیەکی ڕوون کاریگەریی لەسەر فراوانکردنی دیاردەی پرسیاری منداڵان و وردەکارییان دەبێت. ئەو پەروەردەکارەی هەلی بۆ دەڕەخسێنێت و بە دڵخۆشییەوە پێشوازی لە دەربڕینی منداڵان دەکات، دەچێتە ناو قووڵایی دەروونیان، بەڵام ئەو پەروەردەکارەی توانای گوێگرتنی پرسیاریانی نییە و ڕەتیان دەکاتەوە، یان بە هاوارکردن و تووڕەیی وەریاندەگرێت، هیچ شتێك لە منداڵ نابینێت.[3] گەرچی ئێمە

---

[1] سەیری (أهم القواعد في تربية الأبناء، د. عبدالكريم بكار،) بکە، (لا ٣٣).

[2] سەیری (تأسيس عقلية الطفل، د. عبدالكريم بكار) بکە، (لا ١٦).

[3] سەیری (الأسئلة العقائدية عند الأطفال والإجابة عليها، د. بسام العموش) بکە، (لا ١٠).

هاوڕاین، کە لە بەرژەوەندیی منداڵدا نییە، یان باش نییە منداڵ سەری لە هەموو شتێك دەربچێت، بەڵام لە هەمان کاتدا گرنگە منداڵ لە پرسیارکردن لەبارەی هەندێ بابەتەوە هەست بە ترس نەکات، کە کاریگەرییان لەسەر ژیانی هەیە. گرنگە منداڵ هەست نەکات، کە پشتگوێ خراوە، یان بڕوای پێ ناکرێت. لە هەموویشی گرنگتر ئەوەیە، کە: منداڵ لە کاتی قسەکردن لەگەڵ کەسوکاریدا هەست بە ئارامی و ئاسوودەیی بکات.[1]

## هۆکاری زۆر پرسیارکردن لای منداڵان:

**دەکرێت گرنگترین ئەو هۆکارانەی وا لە منداڵان دەکەن پرسیاری زۆر بکەن، لەم چەند خاڵەدا کۆیکەینەوە:**

١- حەزی بەدواگەڕانی منداڵان، وەك ئامرازێك بۆ تێرکردنی پێویستییەکانی گەشەی عەقڵیان.[2]

٢- پێویستیی منداڵ لە تێگەیشتنی هەر دیاردەیەکی دەوروبەری.

٣- ترس و دڵەڕاوکێی منداڵ لە شتەکان، ئەمەیش لەبەر ئەوەی ئەزموونی پێشوەختەیان نییە، بۆ نموونە: منداڵ لە ئاژەڵ دەترسێت، گەر هێرشیشی نەکاتە سەر، بۆیە پرسیاری زۆر دەکات، بۆ ئەوەی هەست بە ئارامی بکات.

---

[1] سەیری (القواعد العشر- أهم القواعد في تربية الابناء، د. عبدالكريم بكار) بکە، (لا ٣٦).

[2] سەیری (الطفل وحب الاستطلاع، عمر السبع، موقع مفكرة الإسلام، تاريخ النشر ٢٠١٢/١/٥) بکە، هەروەها سەیری (دارسات في حب الاستطلاع والإبدع والخيال، د. شاكر عبدالحميد وعبداللطيف خليفة) بکە، (لا ٣٣).

٤- گەشەکردنی توانای قسەکردنی منداڵ، کاتێك پرسیار لە دوای پرسیار دەکات، ئەمە هێندە بۆ حەزی بە دەستهێنانی وەڵام نییە هێندەی ئەوەی حەزی بەکارهێنانی زمان و خۆهەڵدانەوەیە بە توانای قسەکردن و بەشداریکردنی لە بۆنە کۆمەڵایەتییەکان.

٥- هەلی پەیوەندی بەستن و بەشداریکردنی سۆزدارییانە لە نێوان باوان و منداڵاندا.

٦- گەشەکردنی بڕوابەخۆبوونی منداڵ و بڕوابوون بە دایك و باوکی، گەشەکردنی ڕێزگرتن لە خودی خۆی.[1]

## سروشتی پرسیار لای منداڵ:

بۆ ئەوەی بە باشی لە پرسیاری منداڵان بگەین، پێوستە جیاوازی بکەین لە نێوان پرسیارە عەقلی و زمانەوانییەکان و پرسیارە دەروونییەکاندا. لە جۆری یەکەمیاندا منداڵ هەوڵ دەدا شتێك بزانێت، یان هەواڵ لەبارەی شتێکەوە بدات، بەڵام جۆری دووەمیان پاڵنەرەکەی ئارامیی دەروونییە. لێرەدا وەڵام بەتەنیا مەبەست نییە، بۆیە پێویستە ڕاستییەکی سەرەکی بزانین ئەویش بریتییە لەوەی، کە: ئەم پرسیارانە بەڵگەی بارودۆخێکی سەلمێنەریان هەڵگرتووە، ئێمە ناتوانین بەهای

---

[1] (أسئلة الأطفال المحرجة وكيفية الإجابة عليها، د. مصطفى أبو سعد)، لە لاپەڕەی خۆی لە (فەیسبووك)، مێژووی بڵاوکردنەوەی ٢٠١٤/٥/٢٣. هەروەها سەیری (حول فقه التربية وفضول المعرفة، د. عبدالرحمن ذاكر، موقع فن الحياة) بکە، (لە ٢٠١٤/٧/٩).

پرسیارەکە هەڵبسەنگێنین، یان تێی بگەین و واتاکەی دیاری بکەین، مەگەر لەمیانەی ئەو بارودۆخەی پاڵی بە منداڵەکەوە ناوە بۆ کردنی ئەم پرسیارە. خودی پرسیارەکە بەهایەکی تایبەتی نییە، بەڵام هێز و واتا و گرنگییەکەی لە سروشتی ئەو بارودۆخەوە وەردەگرێت، کە لە دەوروبەریدایە.

**پرسیارەکانی منداڵان، سێ ئەرکی گرنگیان هەن:**

١- بەدیهێنانی هاوسەنگیی دەروونیی منداڵ، زۆربەی پرسیارەکانی منداڵان ئامانجەکانیان دەروونییە.

٢- بیرکردنەوەی ئەنجامگیری، منداڵ بە پشتبەستن بەو زانیارییانەی لەبەردەستن هەوڵ دەدات بگاتە زانیاریی نوێ، بۆ ئەوەی زانیارییەکانی تریان لەسەر بنیاد بنێت، یان پێکەوەیان ببەستێتەوە.

٣- ناسینی ژینگەی دەوروبەری و کاروبارە گرنگەکانی ژیان، لەوانە: ناسینی بەها ڕەوشتی و ڕەفتارییەکان، کە دەکەونە ئەو چوارچێوە ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتییەی منداڵ تیایاندا دەژی.[١]

---

[١] سەیری (أسئلة الطفل وعلاقتها بتنمية القدرات العقلية وآفاقها عند الطفل، حسين سباهي)، ماڵپەری (الألوكة) بکە، مێژووی بڵاوکردنەوە (١٤٣٢/١٢/١هـ.

## جۆرەکانی پرسیار لای منداڵ:

پێویستە جۆری ئەو پرسیارانەی منداڵ دەیانکات ڕێك بخرێن، بەوپێیەی وەڵامەکانیش بە ڕێکخستنی پرسیارەکان جیاوازییان دەبێت، دەکرێت پرسیاری منداڵان بۆ ئەم چەند جۆرانە ڕێکبخرێن:

١- **ئەو پرسیارانەی ڕوویەکی زمانەوانییان هەیە:**

بۆ نموونە: بۆچی ئەو شتانە ئەم ناوانەیان لێنراون؟ بۆ ناوەکان ناگۆڕین؟ بۆ زمانێکی تر داناهێنین؟

٢- **پرسیار لەبارەی بوونەوە:** لە کوێوە هاتووین؟ بۆ کوێ دەچین؟ منداڵ چۆن دێت؟ مردن واتای چییە؟ ئەی لەبارەی گەردوونەوە چی؟ هەروەها گەلێك پرسیاری تر....

٣- **پرسیاری یاخیبوونانە:** خۆی لەو بیرۆکەیەدا دەبینێتەوە: بۆ لە هەندێ بابەتدا وەك گەورەکان ڕێگە بە منداڵان نادرێت؟ ئەم جۆرەیان زیاتر وەك هەوڵێك بۆ لاسایکردنەوەی گەورەکان دێت، نەك وەك شێوەی پرسیار.

٤- **پرسیاری تاقیکاری:** ئەو جۆرە پرسیارەیە، کە منداڵ بە مەبەستی تاقیکردنەوەی کەسوکاری دەیکات، یان ڕەخنەگرتن لەو شتەی پێیوایە کەموکوڕییە لە لای کەسوکاری. زۆرترین جار بەراوردکاری دەکات لە نێوان کەسوکاری خۆی و کەسوکاری هاوڕێکەیدا، هەندێ جاریش ئەم جۆرە پرسیارانە دەرهەق بە توانا ماددی و جەستییەکانی کەسوکار خۆیان دەبیننەوە.

٥- **پرسیاری شپرزەیی منداڵ:** زۆرجار منداڵ کۆمەڵە پرسیارێك دەکات قەرەبووی ئەو شپرزەیی و نائارامییە دەکاتەوە، کە لەگەڵێدایە. ئەو پرسیارانەی دەیانکات، پرسیارە دەربارەی دیارنەمانی دایکی، یان باوکی، یان شێوازەکانی تر دوورکەتنەوە و جیابوونەوە.

٦- **پرسیاری دۆزینەوەی جەستە:** لە پێشەکیی ئەو پرسیارانەی لەو بارەیەوە دەیانکات، پرسیاری پەیوەندیدارە بە جیاوازیی جەستەی نێوان هەردوو رەگەز.

ئەم جۆرە رێکخستنە یارمەتیی کەسوکار دەکات لە پاشخانی پرسیاری منداڵەکانیان بگەن، ئەوان هەر لەخۆڕا پرسیار ناکەن، بەڵکو بە مەبەستی هەوڵدان بۆ تێگەیشتن دەپرسن.[1]

**بۆچی دایکان و باوکان خۆیان لە پرسیاری منداڵان بێئاگا دەکەن؟!**

پشتگوێخستنی پرسیاری منداڵان و هەندێ جار بۆڵەبۆڵ و بێزاربوون بەرامبەریان، هۆکارەکەی بە تەنیا ئەوە نییە دایك، یان باوك وەڵامەکان نازانێت، یان بێئاگایی بێت لە رۆڵی دەروونی و پەروەردەیی" بەڵکو هۆکاری تری هەن، کە گرنگترینیان ئەمانەن:

١- هەستێکی گەورە بە سەیروسەمەرەیی پرسیارێکی بچووك، یان بێبایەخی و جددییەتنەبوونی پرسیارەکە، ئەمەیش وا دەکات کەسی گەورە گرنگیی پێ نەدات، یان ئاوڕی لێ نەداتەوە. لێرەدا گەورەکان دەکەونە هەڵەی پێشێلکردنی مافی منداڵانەوە، لەو کاتەی منداڵان بە

---

[1] سەیری (أسئلة الأطفال المحرجة وكيفية الإجابة عليها، د.مصطفى أبو سعد) بکە لە لاپەڕەی تایبەتی (فەیسبوك)، لە مێژووی بڵاوکردنەوەی ٢٠١٤/٥/٢٣.

ڕێگە تایبەتییەکەی خۆیان بە سادەیی و ڕوونی بیر دەکەنەوە... ئەم پێشێلکردنە جۆرێکە لە دەسەڵاتی عەقڵی، کە گەورەکان بەکاری دەهێنن، بێئاگا لەوەی منداڵ لە ڕوانگەی حەزێکی ڕاستگۆیانەوە پرسیارێکی سادە دەکات بۆ وەرگرتنی زانیاری، یان دۆزینەوەی شتێکی دەوروبەری" ئەمە سەرباری بوونی هۆکاری دەروونی بۆ پرسیارەکە، کە بریتییە لە گەڕانەوەی هاوسەنگیی دەروونی و لەوانەیە هاوسەنگییەکەی لە بارودۆخێکدا لەدەست دابێت.

٢- گەورەکان هەست بە گرانیی ئەو پرسیارە دەکەن، کە منداڵ دەیکات، بەتایبەت کاتێك پرسیارەکە پەیوەندیدار بێت بە قەدەغەکراوە کۆمەڵایەتی و ڕەوشتییەکانەوە، کە بۆی نییە باسیان بکات، تا دەگاتە تەمەنێکی دیاریکراو. بۆیە گرانیی پرسیارەکان و بێزارییان، گەورەکان دەخاتە سەرسامییەوە. لێرەدا پێویستە لەسەر گەورەکان بەباشی خۆیان ئامادە بکەن، تا بتوانن وەڵامێکی دروستی ئەم جۆرە پرسیارانە بدەنەوە.

٣- هەندێ جار زۆر پرسیارکردن، یان زۆر بەدوای یەکدا هاتنی پرسیارەکان هۆکارێکە بۆ پشتگوێخستنیان لە لایەن گەوەکانەوە. ئەگەر گەورەکان گرنگیی پرسیاری منداڵانیان لە ڕووی دەروونییەوە بزانیایە، ئەوکات هەڵوێستێکی تریان دەبوو، کە بریتی دەبوو لە هاندانیان بۆ ئەوەی بە بەردەوامی پرسیارەکانیان بکەن، وەك ئەوەی منداڵەکان بە دەنگی بیستراو بیردەکەنەوە.

٤- یەکێك لەو هۆگارانەی وا دەکات گەورەکان گرنگیی پێویست بە پرسیاری منداڵان نەدەن و ئاوڕیان لێ نەدەنەوە ئەوەیە، کە پرسیارەکان بە شێوەیەکی ناڕوون دێن و بە ڕاستەوخۆ ناکرێن.

٥- هەڵاتنی دایکان و باوان لە وەڵامدانەوە، لەوانەیە لە نەزانینیانەوە بێت بەرامبەر داوای منداڵەکە، ئێمە پێیان دەڵێین: پێویستە لەسەرتان بە دوای وەڵامی منداڵەکانتاندا بگەڕێن و بە ڕاستگۆیی و دەستپاکییەوە پێیان رابگەیەنن.[١]

٦- پرسیارەکان لە ئاستی عەقڵی منداڵەکان تێدەپەڕن، ئەمەیش وا دەکات وەڵامەکانیان ئاستبەرز و قورس بن، بۆیە دایك و باوکان دەست دەکەن بە بیرکردنەوە بەوەی منداڵەکە چۆن گەیشتووەتە ئەم پرسیارە[٢]، وەڵامەکەی پشتگوێ دەخەن.

## دایك و باوکان چۆن مامەڵە لەگەڵ پرسیاری منداڵەکانیان دەکەن؟

بەرپرسیارێتیی دایکان و باوکان بریتییە لە پێشکەشکردنی وەڵامی ڕاست بۆ پرسیاری منداڵەکانیان، وەکو چۆن لەسەریانە هەموو ڕێگە و هۆیەکانی گفتوگۆ و ڕاگۆڕینەوە لەبارەی پرسیارە ئیمانییەکانی منداڵانەوە بڕەخسێنن و هاوکارییان بکەن لە دەربڕینی هەر بیروبۆچوونێکیان دەربارەی ئایین، ئەمەیش لەپێناو چەسپاندنی متمانە و دڵنیایی و تێگەیشتنی دروستی بۆ ئایین، کە هاوسەنگی ئایینییان بپارێزێت دوور لە کەمتەرخەمی و پەڕگیری.[٣] ڕاستە لەسەریان پێویست

---

[١] سەیری (أسئلة الطفل وعلاقتها بتنمية القدرات العقلية وآفاقها عند الطفل، حسين سباهي) ماڵپەری (الألوكة) مێژووی بڵاوکردنەوە، ١٤٣٢/١٢/١ هـ.

[٢] سەیری (أسئلة الأطفال الحرجة وكيفية الإجابة عليها، د. مصطفى أبوسعيد) بکە لە لاپەڕەی تایبەتی خۆی لە (فەیسبووك)، مێژووی بڵاوکردنەوە ٢٠١٤/٥/٢٣

[٣] سەیری (علم نفس المراحل العمرية، عمر المفدى، (لا ٤٣٢) بکە.

نییە هەموو وەڵامێکی دروست بۆ پرسیارە ئایینییەکانی منداڵەکەیان بزانن، بەڵام لەسەریانە پایەکانی باوەڕیان بۆ شی بکەنەوە، بۆ ئەوەی لەسەر ئیمانێکی بەهێز بە پەروەردگار گەورە بن.[1] چەند جوانە دایك و باوك کوڕە گەورەگەیان بۆ نووسینەوەی پرسیاری منداڵ ڕابسپێرن! ئەو کوڕە، یان ئەو کچە، ئەگەر هەستی بە هاندان و بایەخپێدانی دایك و باوکی کرد، ئەویش پێشوازیی لەم ئەرکەی دەکات و تاموچێژی لێ دەبینێت. ئێمە سوود لەم ڕێگەیە دەبینین لە چەند لایەکەوە، لە لایەکەوە بەهای پرسیارەکان و هەستکردن بە بەرپرسیارێتی لە منداڵە گەورەکە دەچێنین، هەروەك چۆن بابەتی بایەخپێدانی بە پرسیاری منداڵان لە لای دەچێنین، کە لە داهاتوودا وای لێ دەکات ئەویش هەمان کار بکات کاتێك دەبێتە دایك، یان باوك. لە لایەکی ترەوە: پرسیارەکانمان بۆ کۆدەکرێنەوە ئەوکات گەڕان بەدوای وەڵامەکانیان ئاسان دەبێت، یارمەتیدەر دەبێت لە پێشبینیکردنی پرسیاری هاوشێوەی برا و خوشەکەکانی تر و خۆ ئامادەکردن بۆی. ئینجا منداڵ چەند دڵخۆش دەبێت کاتێ وەڵامی ئەو پرسیارانەی بدەینەوە، کە پێشووتر کردبوونی، بایەخدان بە وەڵامێکی باش بۆ پرسیاری منداڵەکە، بە پشتیوانیی خوا کاریگەریی گەورەی لەسەر منداڵەکە و لەسەر پەیوەندیی نێوانمان دەبێت" ئەوکات دایك و باوك دەبنە سەرچاوەی باوەڕپێکراوی یەکەمی منداڵ بەدرێژایی ساڵانی داهاتوویش، لەبری وەرگرتنی وەڵام و زانیارییەکانی لە سەرچاوەی گوماناوی، بەتایبەت لەسەردەمی هەرزەکاریدا.[2]

---

[1] سەیری (کیف تقولها لأطفالك، بول كولمان) بکە، (لا ٢٥٣). هەروەها سەیری (عقيدة الطفل المسلم، هيام محمود) بکە، (لا ٢٥٣).

[2] سەیری (طفلك في ارلاعة والنصف، هاين العبد القادر) ماڵپەری (المسلم) بکە، مێژووی بڵاوکردنەوە ١٤٢٨/١٠/١ هـ.

لێرەدا خاڵێك هەیە پێویستە دایکان و باوکان ئاگاداری بن، ئەویش: گرنگیی جیاوازیکردنە لە نێوان دوو جۆری پرسیاری منداڵ، یەکەمیان: پرسیاری پێداگیری، کە هەست دەکەین منداڵ بەردەوام دووبارەی دەکاتەوە و لە زۆربەی ئەندامانی خێزانی دەکات، هەندێ جاریش پرسیاری تری لێ دەبێتەوە. دووەمیان: پرسیاری خستنەڕوویی، ئەم جۆرەیان گەر بە قسەکردن بیبەینە سەر بابەتێکی تر، پرسیارەکەی لە بیر دەچێتەوە. جۆری یەکەمیان باش نییە پشتگوێ بخرێت، دەبێت هەوڵ بۆ دۆزینەوەی وەڵامەکەی بدەین، تەنانەت گەر لە لای کەسێکی تریش بێت، کە وەڵامەکە بەباشی دەزانێت. ئەم جۆرەیان ڕەهەندێکی پەروەردەیی گرنگی هەیە، بەڵام جۆرەی دووەمیان گەر پشتگوێیش بخرێت زۆر گرنگ نییە، بەتایبەت گەر پەیوەندیدار بوو بە چەند بابەتێکەوە مێشکی منداڵ وەریاننەگرێت.

## بنەماکانی مامەڵەکردن لەگەڵ پرسیاری منداڵان:

**کۆمەڵە بنەما و بەهایەك هەن، کە لەسەر دایکان و باوکان پێویستە لە کاتی وەڵامدانەوەی پرسیاری منداڵان پێیانەوە پابەندبن و ڕەچاویان بکەن، ئەوانیش:**

١- **بنەمای ڕێزگرتن:** ئەو دایك و باوکانەی گوێ لە پرسیاری منداڵەکەیان دەگرن، وای لێ دەکەن هەست بکات، کە دایك و باوکی بەشداری خواست و خەمەکانی دەکەن و ڕێزی دەگرن. ئەم جۆرە بەشداریکردنە هاوسەنگیی دەروونی و دڵنیایی بۆ منداڵ دەگەڕێنێتەوە، ئینجا ڕاستەوخۆ لەو منداڵەدا هەست بە بڕوابەخۆبوون و وردبینی لە پرسیارکردن و گفتوگۆکردنی لۆژیکانەدا دەکەین.

٢- **بنەمای متمانە و پارێزراوی:** دایـك و بـاوك بـە دوای وەڵامـی وردەکاری و توندوتۆڵدا دەگەڕێن، تا لە ڕێگەی کۆمەڵە وشەیەکی ناسـراو و ئاساییەوە پێشکەشی منداڵی بکـەن و لـە چوارچـێوەیەکی زانسـتیدا، زانیارییەکانیان بۆ ئاسان بکەن. ڕاستیی وەڵامەکان لە کۆتاییـدا دەبێتـە هۆی هێنانەدیی سەقامگیری و متمانەبەخۆبوون و ئارامیی دەروونی.

٣- **بنەمای چارەسەرکردنی پاڵنەرە تایبەتییـەکانی منـداڵان:** ئـەو پاڵنەرانەی بۆ منداڵ دروست دەبـن لەمیانـەی ژینگـەی دەوروبـەری، بـۆ نموونە: ئەو منداڵەی بەهۆی لەدایکبوونی منداڵێکی تازە لـەناو خێزانـدا هەست بە نائارامی و دڵەڕاوکێ دەکات، پرسیار دەکات: ئەم منداڵـە لـە کوێوە هات؟ بە وەڵامدانەوەیەکی زانسـتی کێشـەکەی چارەسـەر نابێـت، بەڵکو پێوستی بە چارەسەری ئەو پاڵنەرە ڕاستەقینە هەیە، کە پاڵی نـاوە ئەو پرسیارە بکات و دەبێت گرنگییەکی تایبەتی پێ بدرێت.[١]

گـرنگترین شـتێك گـەورەکان بـۆ بچـووکەکان بیکـەن بریتییـە لـە: یارمەتیدانیان لەسەر ڕۆشنکردنەوەی عەقڵیان، ئەمەیش تەنیا لە ڕێگـەی گێڕانەوەی چیرۆك و بەسەرهاتەوە نابێت، بـەڵکو لـە ڕێگـەی ڕاهێنانیـان لەسەر بیرکردنەوە و پێشکەشکردنی پێشنیار دەبێت. ڕابهێنرێن، کە تەنیا بە ڕووکەشی شتەکان قەناعەت نەکەن، بەڵکو پێویسـتە بـیر لـەو شـتانە بکەنەوە، کـە لـە پشـتەوەی شـتە ئاشـکراکانەوەن.[٢] ئـەم ڕێگەیـەیش پێویستی بە ئاوێتەبوونی ئـەرێنی و گفتوگـۆی بنیاتنـەر و ڕاگۆڕینـەوەی

---

[١] سەیری (أسئلة الطفل وعلاقتها بتنمية القدرات العقلية وآفاقها عند الطفل، حسين سباهي) بکە، ماڵپەڕی (الألوكة)، مێژووی بڵاوکردنەوە ١٤٣٢/١٢/١ هـ.

[٢] سەیری (تأسيس عقلية الطفل، د. عبدالكريم بكار) بکە، (لا ٧٨).

بەسوود دەبێت.[١] پێویستە لەسەریان ئەو پرسیارانە ئاراستەی منداڵەکانیان بکەن، کە هانی بیرکردنەوەیان دەدەن.

دەکرێت وەڵامەکە بە شێوەی فراوانتر بدرێتەوە، دایك و باوك دەتوانن داوا لە منداڵ بکەن لە کۆبوونەوەی خێزانیدا پرسیارەکانیان بخەنەڕوو، پاشان بوار بە هەموان بدرێت بەشداربن لە وەڵامدانەوەی، ئەگەر پرسیارەکە ئاسایی بوو و هیچ ڕەهەندی قووڵ و هەستیاریی تێدا نەبوو، بەڵام زۆر گرنگە منداڵ ڕووبەڕووی گاڵتەپێکردنی براگەورەکەی نەبێتەوە لە بەرامبەر پرسیارە سادەکەی" ئەگەر ئەمەیش ڕوویدا، لەسەر دایك و باوك پێویستە لەپاڵ منداڵە بچووکەکە بوەستن و ستاییشی ئازایەتیی بکەن و بۆی ڕوون بکەنەوە، کە هەموو پێویستمان بە پرسیارکردن هەیە. هەروەها ئەو فەرمایشتەی خوای گەورەی بۆ باس بکەن، کە دەفەرموێت: ﴿ وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴾ الإسراء: ٨٥

واتە: "(ئەی خەڵکینە!) هیچتان پێ نەبەخشراوە لە زانست و زانیاری تەنیا شتێکی کەم نەبێت". لەمیانەی وەڵامی کۆمەڵی ئەندامانی خێزاندا، کۆمەڵێك ئامانج دەهێنینەدی، کە دەروازەی هەموویان پرسیاری منداڵەکانە.

---

[١] سەیری (برنامج مقترح لتدريب الروضة على إجابة التساؤلات العلمية المحرجة لدى الأطفال، أ. د. ماهر صبري) بکە، (لا ٢٥٣).

## پەروەردەکردن بە گفتوگۆ:

ڕێگەی گونجاو بۆ منداڵ، بریتییە لە ڕێگەی گفتوگۆ، کە لەسەر بنەمای ڕاگۆڕینەوە و پرسیار و وەڵام بنیاد دەنرێت، چونکە یارمەتیی کرانەوەی زمان و توانای فێربوون دەدات، بۆیە گفتوگۆ ئەم ئامانجە دەهێنێتەدی.[1] پێویستە منداڵ لەمیانەی گفتوگۆکردندا هەست بە ڕێزگرتن بکات، کە وا دەکات هەست و سۆزی منداڵ لەدەست دڵەڕاوکێ و ترس و ململانێی دەروونی و سەرکوتکردن ئازاد بێت، هەر کاتێکیش منداڵ لە کاتی گفتوگۆدا هەستی بە ئارامی کرد لەگەڵ کەسی گفتوگۆکار" هەرچی لەناو دەروونیدایە لە ململانێی دەروونی و هیلاکی، بەتاڵی دەکاتەوە. ئەو کاتەیش، کە هەردوو لای گفتوگۆکە دەگەنە زانینی هۆکاری کێشەکە و منداڵەکە هەرچی لەناو دڵیدایە دەریببڕێت، ئەوکات چارەسەکردن ئاسان دەبێت و سەرکەوتن تێیدا بەردەست دەبێت.[2]

گفتوگۆی نێوان منداڵ و باوانی، چەند سوودێکی بۆ خێزان هەیە، لەوانە:

- **یەکترناسین:** منداڵ لە سەرجەم ئەندامانی خێزان نزیك دەبێت.
- **پێکبەستنەوەی دڵەکان:** گفتوگۆکردن، لێکنزیکبوونەوە و دڵبەستنەوەی ئەندامانی خێزان بە یەکتری زیاتر دەکات و خۆشەویستیی یەکتریان لە لا دروست دەکات.

---

[1] سەیری (مقدمة ابن خلدون) بکە، (لا ٥٤٥)

[2] (الحوار وبناء شخصية الطفل، سلمان خلف الله)، (لا ١٥٠ - ١٠٨).

- **لاواندنـــەوە:** ئێمـــە بـــە گفتۆگـــۆکردن، تـــەنیا مەبەســـتمان دروستکردنی کەشێکی فەرمی نییە، بەڵکو واتای ڕاستەقینەی گفتوگـۆ بریتییە لە وشەی شیرین و دروســتکردنی کەشـێکی ئـارام و لاواندنـەوەی یەکتری.[1]

**لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت پەروەردە بە شێوازی گفتوگـۆ بـە چـەند خاڵێك دەناسرێتەوە، لەوانە:**

١- دۆزینەوەی ڕاسـتییەکان و ئـازادیی بیرکردنـەوە دەداتـە خـودی منداڵ، ئەمەیش لایەنی داهێنان و گەشەکردنی کەسایەتی لە لای منـداڵ هان دەدات.

٢- ئاسانە و هیچ زەحمەتێکی تێـدا نییـە، منـداڵ بەئاسـوودەیی و بەبێ شەرمکردن مامەڵەی لەگەڵ دەکات.

٣- خۆشی و کامـەرانی و هەسـتکردن بـە خـود لـە دڵـی منداڵـدا دەچێنێت، فێری دەکات چۆن گوێ بۆ بەرامبەری بگرێت.

٤- هەلی گەڕان و بیرکردنـەوەی داهـاتووی بـۆ دەرەخسـێنێت، لـە گۆشـەنیگای جیاجیـا سـەیری بابەتـەکان دەکـات، لەسـەر بیرکردنـەوەی لۆژیکانە ڕایدەهێنێت.

٥- هۆشـیاری، منـداڵ بـەئاگا دەهێنێتـەوە، لـە پەرتـەوازەیی و کەمتەرخەمی دووری دەخاتەوە[2]، پاڵی دەنێت چالاکانە جوولە بکات.

---

[1] (كيف أجيب عن أسئلة طفلي وأحاوره، <زسلوى مرتضى)، (لا ٢١، ٢٣).

[2] سەیری (الحوار وبناء شخصية الطفل، سلمان خلف الله) بكە، (لا ٧٧)، هەروەها سـەیری (منهج التربية النبوية للطفل، محمد سويد) بكە، (لا ١١٩)، سەیری (مهارات التواصل مع الأولاد، د. خالد الحليبي) بكە، (لا ٥٤٥)

## داڕشتنی پرسیاری گفتوگۆکردن:

**شێوازی پرسیارکردن زۆرن دەکرێت بە ڕێگەی گفتوگۆکردن لە منداڵ بکرێن، لەوانە:**

- **(چی ڕوودەدات؟)**: ئەم شێوازە یارمەتیی منداڵ دەدات بە دوای ئەو شتانە بگەڕێت، کە لەدەوروبەریدا ڕوودەدەن، یارمەتیی دەدات وەسفی ئەو شتانە بکات، کە دەیانبینێت.
- **(چیت دەوێت؟)**: ئەم شێوازە یارمەتیی دەدات پێویستییەکانی خۆی دیاری بکات.
- **(چۆن ئەم شتە دەکەیت؟)**: ئەم شێوازە یارمەتیی دەدات بە ئازادانە بیربکاتەوە، خەیاڵی هاندەدات بە دوای وەڵامدا بگەڕێت.
- **(بۆچی ئەمە ڕوودەدات؟)**: ئەم شێوازە یارمەتیی دەدات ڕووکەشی شتەکات تێبپەڕێنێت و بە دوای هۆکاری ڕوودانیاندا بگەڕێت، دەست دەکات بە شیکردنەوە و گەڕان بۆ بەستنەوەی شتەکان بە یەکترەوە.
- **(گەر ئەمە ڕوویدا، چی بکەین؟)**: ئەمە وای لێ دەکات دووبارە بیربکاتەوە و لە ڕوانگەی جیاوازەوە چاو بە هەندێك ڕووداودا بخشێنێتەوە.

ئەو پرسیارانەی دەکرێت ئاراستەی منداڵان بکرێن جۆراوجۆرن، بەڵام لە گرنگترین تایبەتمەندییەکانی پرسیاری باش، کە لە شێوازی گفتوگۆکردن لەگەڵ منداڵدا بەرهەمی دەبێت، ئەمانەن:

١- پێویستە بەگوێرەی توانا کورت بن.

٢- پێویستە ڕوون و دیاریکراوبن لە چوارچێوەی یەك بیکردنەوەدابن.

٣- پێویستە لەگەڵ تەمەنی منداڵ و شوێن و کات و ئەو بارودۆخەی لێی دەژی گونجاوبن.

٤- نابێت پرسیارەکە وەڵامی ڕاست و چەوت لەخۆبگرێت، بەڵکو پرسیارێك بێت مێشکی منداڵ بجوولێنێت و ئاسۆی فراوان بکات، بە جۆرێك بێت بواری پێ بدرێت بیر لە وەڵامەکەی بکاتەوە.[١]

## شێوازەکانی وەڵامدانەوەی پرسیاری منداڵان:

لە لاپەڕەکانی پێشوودا باسی پرسیارەکان و جۆر و شێوازەکانیان کرا... لێرەدا باس لە وەڵامەکان دەکەین، بەوپێیەی شێوازەکانی وڵامدانەوەی پرسیاری منداڵان بەگوێرەی کات و شوێن و بارودۆخی دەوروبەر دەگۆڕێن، لە دیارترین شێوازەکان ئەمانەن:

١- **وەڵامدانەوەی ڕاستەوخۆی زارەکی:** ئەم جۆرەیان لە هەموو جۆرەکانی تر باوترە، منداڵ پرسیارەکەی دەکات و کەسوکارەکەیشی ڕاستەوخۆ بە شێوەی زارەکی وەڵامی دەدەنەوە، زۆربەی جار ئەم شێوازە خێرا و کورتە.

٢- **وەڵامدانەوەی لەمیانەی چیرۆکی کورت:** ئەم جۆرەیان

---

[١] سەیری (استراتيجية الأسئلة لتعليم التفكير، محمود طافش الشقيرات) بکە، لە ماڵپەری تایبەتی خۆی" هەروەها سەیری (استراتيجيا التدريس في القرن الحادي والعشرين، د. ذوقان عبيدات و د. سهيلة أبو السميد) بکە، (لا ٢٥٣).

وەڵامدانەوەی ناڕاستەوخۆیە، دەبێت گێڕانەوەی چیرۆکەکەیش لەگەڵ سروشتی پرسیارەکە گونجاو بێت، وا باوە منداڵ زۆر حەز بەم جۆرە وەڵامدانەوە دەکەن و بەتامەزرۆییەوە گوێی بۆ دەگرن.

٣- **وەڵامدانەوە بە وێنە:** منداڵ لەوانەیە پرسیارێك بکات، بۆ وەڵامدانەوەی پێوستی بە وێنەی ڕوونکردنەوە هەبێت، لە نموونەی پرسیاری زانستی، ئەوکات وێنە دەبێتە سەرچاوەیەکی سەرەکیی زانیاری، بەتایبەت گەر وێنەکە ڕەنگاوڕەنگ و سەرنجڕاکێش بێت.

٤- **وەڵامدانەوە لە ڕێگەی سەرنجدان:** لەوانەیە منداڵ پرسیارێك بکات و بکرێت بە شێوەیەکی کرداری وەڵامی بدرێتەوە، ئەویش بە دەستگرتنی منداڵەکە بۆ شوێنی وەڵامەکە، بۆ ئەوەی سەرنجی شتەکان بدات و خۆی وەڵامەکەی لێ هەڵێنجنێت، وەك پرسیاری منداڵ لەبارەی ئاژەڵانی ژینگە، چۆن دەژین؟ چی دەخۆن؟ چۆن زیاد دەکەن؟[1]

**کۆمەڵە ڕێنماییەکی گشتی، کە پێویستە لە کاتی وەڵامدانەوەدا ڕەچاویان بکرێن:**

١- سووربوون لەسەر بڕواپێهێنانی منداڵ بە ڕێگەی گفتوگۆ و پرسیارکردن و ڕاوەرگرتن، پشت نەبەستن بە شێوازی بەگوێداخوێندن (تەلقین)، کاتێکیش تەواو دەبین پێویستە دڵنیابین لەوەی منداڵەکە بڕوای بە وەڵامەکە کردووە و ڕازی بووە.

٢- لە وەڵامدانەوەدا ڕاستگۆبە، بە مەبەستی خۆدزینەوەت درۆ لەگەڵ منداڵەکەت مەکە لە وەڵامدانەوەیدا، پیداگیربە لەوەی -

---

[1] سەیری (كيف أجيب عن أسئلة طفلي وأحاوره، د. سلوى مرتضى (لا ٧٣ - ٧٤). بکە.

هەرچییەك بێت - وەڵامی هەڵە بە منداڵەکەت نادەیتەوە، ڕاستبێژیی وەڵامەکان و واقیعییەتیان ئاستی متمانەی منداڵەکەت بە تۆ دیاری دەکەن.

٣- سووربە لەسەر ئاسانکردنی وەڵامەکانت، بۆ ئەوەی لای منداڵ ئاسان بێت و بگونجێت لەگەڵ عەقڵە چکۆڵەکەی، خۆت بەدووربگرە لە ناڕوونی، کە مێشکی ئاڵۆز دەکات، هەوڵ مەدە بە بیانووی ئەوەی منداڵەکەت هێشتا بچووکە و توانای تێگەیشتنی ڕاستییەکانی نییە، زانیاریی کەموکوڕی پێ بدەیت، چونکە ئەم زانیارییانە لە مێشکیدا هەڵدەکۆڵرێن.[1]

٤- وا مامەڵە لەگەڵ منداڵەکەت مەکە وەك ئەوەی گێل بێت، ئەو توانای هەیە گەر تۆ شێوازێکی جوانت لەگەڵ بەکارهێنا لە شتەکان بگات، هەوڵ بدە وەڵامەکان ڕاستەوخۆ و پێ پێچوپەنابن، بۆ ئەوەی منداڵ نەکەوێتە ناو خواروخێچییەکی دوور لە ناوەڕۆکەوە.

٥- ئەگەر پرسیاری منداڵەکەت هەرچۆنێك بێت، سەرزەنشتی مەکە و گاڵتەی پێ مەکە و پێیدا هەڵمەشاخێ، وای تێبگەیەنە، کە تۆ لە هەموو کاتێکدا ئامادەیت وەڵامی هەموو پرسیارەکانی بدەیەوە[2]، چونکە گاڵتەکردن وا لە منداڵ دەکات ڕێی لێ ون ببێت و متمانە بە خۆی نەکات و دەستبەرداری حەزی گەڕان ببێت.

٦- شپرزە مەبە لە سەرسووڕمانەکانی منداڵەت بەرامبەر خوای

---

[1] سەیری (كيف تربي أبناءك في هذا الزمان، د. حسان شمسي باشا) بکە، (لا ١٢٢).
[2] سەیری (ابني مكتشف كيف أعيه على اكتشافه؟، منصور السني) بکە، (لا ٣٣).

بەدیهێنەر، یان لە بەرامبەر ئەوەی توانای نییە لە بوونی خوا بگات، لـە وەڵامدانەوەی هەڵنەیەیت، چونکە ئەم کارە وا دەکات بە دوای سەرچاوەی تردا بگەڕێت لە شوێنی تر.

٧- دوودڵ مەبە لە داواکردنی ماوەیەك بۆ ئەوەی بـە دوای وەڵامـی ڕاستدا بگەڕێیت، چونکە وا نیشان بدەیت بە دوای زانیاریدا دەگەڕێیت زۆر باشترە لەوەی خۆت وەك کەسێکی نەفام نیشان بدەیت گوایە زانستت لایـە. هیچ نەنگی نییە بە منداڵەکەت بڵێیت چاوەڕێم بکە، تا وەڵامی ڕاستت بـۆ دەدۆزمەوە.[١]

٨- بە بایەخەوە پرسیاری منداڵەکەت وەربگرە و گوێی بۆ شل بکە، پشتگوێی مەخە، یان خـۆتی لـێ نـەزان مەکـە، چـونکە بایەخپێـدان بـە منداڵەکەت لە ڕووی دەروونییەوە یارمەتیی دەدات بەهۆی شیکردنەوەکەت لەو شتانە تێبگات، کە تێگەیشتنیان قورسە.[٢]

٩- گەر بەڕاستی سەرقاڵ بوویـت، پێویسـتە بـە نـەرمونیانی تێـی بگەیەنیت، کە ئێستا کاتەکە بۆ وەڵامدانەوە گونجاو نییە، سـووربە لەسـەر ئەوەی هەر کاتێك دەستت بەتاڵ بوو، بچیتەوە لای.

١٠- خـۆت بـە دوور بگـرە لـە درێـژدادڕی و شـیکردنەوەی زۆر، وەڵامدانەوەی پرسیاری منداڵێکی شەش ساڵان پێویسـتە کـورتتر بێـت لـە وەڵامی منداڵێکی دە ساڵان، ئەمە ئەگەر پرسیارەکە پێویستی بە وەڵامـی درێژ و بەڵگەهێنانەوە هەبێت، یان ئەو پرسیارانەی پەیوەندییان بـە نادیـار

---

[١] سەیری (أسئلة طفلك الحرجة، أبو المجد حرك) بکە، (لا ١٠).

[٢] سەیری (هل طفي ملحد، إعداد: لجنة الدعوة الإلكترونية) بکە.

(غەیب)ـەوە هەیە" بەڵام ئەو پرسیارانەی وەڵامیـان دیـاریکراوە، ئاسـاییە ئەگەر بۆ هەموو تەمەنێك بەیەك شێواز بێت.[1]

١١- بەگوێرەی توانا وەڵامەکان بـە شـتەکانی دەوروبـەر لـە واقیـع ببەستەوە، خۆبـەدوورگرتن لـەو شـتانەی تێگەیشـتنیان لـە لای تەمـەنی منداڵ قورسە. هەوڵ بدە، تا بکرێت وەڵامـەکان بـە زانیـاریی بەڵگـەدار و لۆژیکیانەبن.[2]

١٢- رێککەوتن و ئاگالێبوون لـە نێـوان دایـك و بـاوك هـەبێت لـە پێدانی وەڵام بۆ منداڵ، واتە: لەکاتی پێدانی زانیاری بە منداڵ قسـەکانیان دژی یەك نەبن.

١٣- پرسیاری منداڵەکە بە پرسیارێکی تر وەڵام نەدرێتـەوە، وەك ئەوەی باوك پێی بڵێـت: (مەبەسـتت چییە؟)، لێـرەدا منـداڵ هەسـت بـە تێکشکان دەکات، چونکە نەیتوانیوە پرسیارەکەی بگەیەنێتە باوکی، لەبەر ئەوەی منداڵ وا دەزانێت دایك و بـاوکی بـەبێ شـیکردنەوە و تەفسـیکردن توانای تێگەیشتنی قسەکانی ئەویان هەیـە، لـەم حاڵەتانـەدا باشـترە ئـەم شێوازە بەکاربهێنرێت (تۆ مەبەستت ئەمەیە...).

١٤- کاتێك منداڵ لە سەرچاوەیەکی تر وەڵامێکـی وەرگرتـووە، کـە جیاوازە لە شێوازی دایك و باوکی، با دایك و بـاوك ڕای خۆیـانی بەسـەردا

---

[1] سەیری (أسئلة الأطفال المحرجة وكيفية الإجابة عليها، د. مصطفى أبو سعد) بکـە، لـە لاپەڕەی تایبەتی لە (فەیسبووك)، مێژووی بڵاوکردنەوە ٢٠١٤/٥/٢٣

[2] سەیری (كيف أجيب عن أسئلة طفلي وأحاوره، د. سلوى مرتضى) بکە، (لا ٧٣).

فەرز نەکەن. لەم حاڵەتەدا پێویستە منداڵەکە فێری وەڵامی ڕاست بکرێت بە ڕێگەیەکی ئاسانکراو و دروست، کە بتوانێت متمانە بە دایك و باوك بە دەستبهێنێت، نەك پێچەوانەکەی.[1]

١٥- هەوڵ بدە وڵامەکە لە چوارچێوەی گفتوگۆکردن بێت، نەك لە شێوەی بەگوێداخوێندن، نموونەی زۆر و چیرۆك و پەند و ئامۆژگاریی تێدا بێت لەگەڵ بەکارهێنانی فەرهەنگی زانستیی وێنەدار.[2] ئەمەیش لەپێناو گەیاندنی واتا و پەیامەکەیە بۆ مێشکی منداڵ، هاوکات بە کارهێنانی یاری جووڵاو و نمایش و وێنە و بیرکردنەوە و هۆنراوە و جووڵاندنی مێشك و یارییەکانی بیرکردنەوە و چیرۆك و ڤیدیۆ و ڕێگەی تر.[3] هەمەجۆری لە ڕێگەکاندا، بیکردنەوەی پێش دەخات و زانیارییەکان لە مێشکدا دەچەسپێنێت.

١٦- هەندێك پرسیار هەن، نابێت وەڵامەکەیان بە یەك جار

---

[1] سەیری (المربون وتساؤلات الأطفال، نوال الخليفة) بکە، (لا ١٢٦-١١٣٠).

[2] دەکرێت سوود وەربگیرێت لە کتێبی تایبەت بە چیرۆکی منداڵان، لە نموونەی ئەم کتێبانە: (قصص تكوين چخصيه الطفل، فيد براكاش) کتێبی زانستی لە نموونەی (سلسلة أسئلة وأجوبة التي تصدرها عالم الكتب)، تا ئێستا ١٦ کتێبی لێ دەرچووە" هەروەها سەیری کتێبی (طفل يقرأ، د. عبدالكريم بكار، لا ١٠١) بکە، کە تیایدا چیرۆکی پێشنیارکراو بۆ هەموو قۆناغێکی تەمەن دەگێڕێتەوە، هەروەها کتێبی (قصص رواها النبي محمد ﷺ، د. عثمان مكانسي) و کتێبی (قصص رواها الصحابة، د. عثمان مكانسي).

[3] سەیری (منهاج تفكر مع أنوس: تجربة جديدة في إعداد مناهج تستند إلى التفكر في بناء العقيدة للطفل، مها شحادة) بکە، (لا ٧). هەروەها سەیری (الارتقاء بالأمة في تعظيم محبة نبي الأمة ﷺ) بکە، (لا ٦).

بدرێتەوە، بەڵکو وردە وردە و بەهێواشی، گەر پرسیاری زیاتری لەسەر کرد وەڵامەکەی بەگوێرەی تەمەن و پرسیارەکە و ئاستی تێگەیشتنی گۆڕانی بەسەردا دێت.[1]

١٧- گەر منداڵەکە گەورە بوو و گەیشتە تەمەنێکی پێگەیشتوو، وا باشترە لەو بابەتەی پرسیاری لەبارەوە دەکات ڕای وەربگیرێت، پرسیارەکەی خۆی ئاراستە دەکەینەوە، بۆ ئەوەی بزانین چۆن مامەڵەی لەگەڵ دەکات، لەمیانەی ئەم کارلێکەوە وەڵامەکە هەڵبهێنجنین. پێویستە واز بهێنین لەوەی منداڵەکە وا لێ بکەین بە مێشکی ئێمە بیربکاتەوە، ئەمە وا دەکات منداڵەکە لەخۆیەوە چوارچێوەیەك بۆ بابەتەکان دابتاشێت، کە هی خۆیان نییە.[2]

---

[1] سەیری (اسئلة الأطفال المحرجة، عائشة الحكمي، شبكة الألوكة) بکە مێژووی بڵاوکردنەوە ١٤٣٤/١/١٧ هـ.

[2] سەیری (القواعد العشر: أهم القواعد في تربية الأبناء، د. عبدالكرم بكار) بکە، (لا ٣٥). هەروەها سەیری (الإشكالية المعاصرة في تربية الطفل المسلم، سعيد عبدالعظيم) بکە، (لا ٥٩).

## هەڵە پەروەردەییەکان لەمیانەی وەڵامدانەوە:

**لە دیارترین ئەو هەڵە پەروەردەییانەی بەرامبەر منداڵان دەیانکەین، ئەمانەن:**

لەبەرچاونەگرتنی لایەنە جۆراوجۆرەکانی پەروەردە، بۆ نموونە: لایەنی ئیمانی، لایەنی ڕەوشتی و لایەنی زانستی، زۆر هەڵەیە جەخت لەسەر لایەنێك بکرێتەوە و لایەنەکانی تر فەرامۆش بکرێن یان هاوسەنگییان لە نێواندا نەکرێت" هەروەها پلەبەندی نەکردن لە پەروەردەکردن، زۆر سەرزەنشت و سەرشکێن کردن و تۆمەتبارکردن بە کەمتەرخەمی، یاخود ڕاوێژنەکردن بە کەسانی خاوەن ئەزموون و پسپۆڕ" هەروەها زۆر پەلەکردن و بەدوادانەچوون، یان ناڕوونی لە پەروەردکردن، یاخود کردارمان پێچەوانەی گوفتارمان بێت، هەندێ جاریش پەیامی نەرێنیی تێکشکێن ئاراستە دەکەین و... هتد.[1] هەموو ئەمانە کۆمەڵە هەڵەیەکن کاریگەرییان لەسەر بنیادی پەروەردەی ئیمانی دەبێت لە دەروونی منداڵدا.

***

[1] سەیری (أخطاؤنا في التربية، د. عبدالرحمن العابد) بکە، (لا ٢٥٣). نوسەر لەم کتێبەدا کۆمەڵێك هەڵە و کەموکوڕی و هۆکارەکانی ڕوودانیانی باس کردووە، هەروەها سەیری (حاول أن تروضني، راي ليفي، وبيل أوهانلون) بکە، (لا ٢٥٣).

# بەشی دووەم
# نموونەی کرداری لە پرسیارە ئیمانییەکانی منداڵان

وەڵامەکانی ئەم بەشە بە پلەی یەکەم ئاراستەی دایکان و باوکان دەکرێن، هەروەها ئەوانەیشی مامەڵە لەگەڵ پرسیاری منداڵان دەکەن لە مامۆستایان و پەروەردەکاران و چاکسازان، ئەوانەی داوایان لێ دەکەین هەوڵ بدەن ناوەڕۆکی وەڵامەکان لەگەڵ تەمەن و ئاستی تێگەیشتنی منداڵ بگونجێنن، چونکە ئێمە ناتوانین یەك وەڵام بۆ هەموو ئاستە جیاوازەکانی منداڵان دابنێین بەهۆی جیاوازیی تەمەن و عەقڵ و تواناکانیانەوە.[1] بۆیە ئەوەی لێرەدا گرنگە ڕۆح و حەقیقەتی وەڵامەکانە، نەك داڕشتنی وشەکان.[2] هەروەها جۆراوجۆرکردنی وتار لە وەڵامدانەوە لە نێوان وتاری ڕاستەوخۆ و وتاری ناڕاستەوخۆدا، بۆ ئەوەی بتوانین زۆرترین ئەندازەی وێناکردنی پرسیارەکان پێشکەشی خوێنەری بەڕێز

---

[1] پەروەردەناسان قۆناغی منداڵی دابەش دەکەن بۆ سەر سێ قۆناغ، یەکەمیان: قۆناغی زوو، کە تەمەنی ٣ بۆ ٥ ساڵان دەگرێتەوە. دووەم: قۆناغی مامناوەند، کە تەمەنی ٦ تا ٨ ساڵان دەگرێتەوە. سێیەم: قۆناغی دوایی، کە تەمەنی ٩ تا ١٢ ساڵان دەگرێتەوە.

[2] سەیری (الأسئلة العقائدية عند الأطفال والإجابة عليها، د. بسام العموش) بکە، (لا ٢٧).

بکەین، خوێنەریش بە ڕۆڵی خۆی ناوەڕۆکی ئەم وەڵامانە وەربگرێت و بەو شێواز و ڕێگەیەی پێیوایە گونجاو و باشە، دایبڕێژێتەوە.

بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارە پەیوەندیدارەکان بە بابەتی ئیمان، پێویستە دایك و باوك لانیکەم هێندە ڕۆشنبیریی شەرعییان هەبێت، کە بتوانن تێگەیشتنە سەرەتاییەکانی ئایین بۆ منداڵان بگوازنەوە، بتوانن بابەتە نادیار (غەیب)ییەکانیان بە جۆرێك بۆ شی بکەنەوە، کە لەگەڵ ئاست و توانا عەقڵییەکانیاندا بگونجێت. ئەو ئاستەنگانەی ڕووبەڕووی پەروەردەکاران دەبنەوە بەتەنیا بریتی نین لە دابینکردنی زانیارییەکان، بەڵکو خۆیان لەوەدا دەبیننەوە، کە چۆن بتوانن ئەو زانیارییانە لە چوارچێوەیەکدا دابڕێژن، کە عەقڵی منداڵ لێی تێبگات و لەگەڵ کات و شوێن و بارودۆخی دەوروبەریدا گونجاو بێت.

ئەوەی لێرەدا خراوەتەڕوو، چەند نموونەیەکی پرسیارێکە، کە لەسەر زاری منداڵان دووبارە دەبنەوە، ئەمە بریتی نییە لە هەموو پرسیارەکان، بەڵکو تەنیا پرسیارە گرنگ و زۆر دووبارەبووەکانن. هەوڵمانداوە باشترین وەڵام لە دیدگای خۆمانەوە دابڕێژین، گەرچی نالێین ئەو وەڵامانە نموونەیین، بەڵکو تەنیا چەند نموونەیەکن بۆ باوان، کە لەوانەوە هەنگاو هەڵبنێن" بێگومان شایەنی پێداچوونەوە و ڕاستکردنەوە و زیادکردن و کەمکردنەوەیشن.

**تێبینی:**

گەر کەسێك وا گومان ببات، کە بەدەست کێشەیەك لە پەروەردەکردنی منداڵەکەیدا دەناڵێت، ئەویش زۆربوونی پرسیاری گوماناوییە لە لای منداڵەکەی، ئەوە هەڵەیە" بەڵکو ئەم حاڵەتە لای منداڵ بە دیاردەیەکی تەندروست دادەنرێت، گوازرشت لە گەشەی سروشتیانە دەکات لە بیرکردنەوەی منداڵ و توانا عەقڵییەکانی، گەر هەر نەنگی و کەموکورییەك ڕوویدا، ئەوە بێتوانایی دایکان و باوکانە، کە توانای وەرگرتنی گەشەکردنی منداڵەکەیان نییە، کە ئاسۆی عەقلیان فراوان دەبێت و پێشوازی لە بوونەوەر و دەوروبەری دەکات.[1] بۆیە ئەم کارە ئەوە لەسەر دایك و باوك پێویست دەکات تێبکوشن بۆ پێشکەشکردنی وەڵامی قەناعەتپێکەر بۆ منداڵەکانیان، وەڵامی قەناعەتپێکەر یارمەتیی منداڵ دەدات لە هێنانەدیی هاوسەنگیی دەروونی و فیکری و کۆمەڵایەتی، بەپێچەوانەی پرسیارە ناڕوون و گوماناوییەکان، یان وەڵامی هەڵە، کە سەرسووڕمان و بیرئاڵۆزی لای منداڵ دروست دەکات" ئەو پەرتەوازەیی و بیرئاڵۆزییەیش، جۆرێك لە شڵەژان لە ڕەفتار و کەموکوڕی لە بیرکردنەوە و مامەڵەکردنی لێ دێتە بەرهەم.

---

[1]- سەیری (هل طفي مُلحد، لجنة الدعوة الاكترونية) بکە.

کێشە و گرفت لە تەمەنی گەورەییدا کتوپڕ دروست نەبووە، ئاگر لـە بزیسکەیەکەوە هەڵدەگیرسێت، زۆربـەی تایبەتمەندییـە ناشـیرینەکان لای مرۆڤ بریتین لە تۆوێکی بچووك، بە پشتگوێخستن و دواخستن ئاو دەدرێت" بێئاگابوون و نەزانی ئاوی ژیانی پێ دەدەن، تا ئەو کاتەی گەورە دەبێت و ڕەگ لـە دڵـدا دەدەکوتێـت، ئـیتر ئـەوکاتیش لەڕەگەوەهەڵکێشـانی ئەستەمە.(١)



## پرسیارە پەیوەندیدارەکان بە باوەڕبوون بە خودا

زۆرترین ئەو پرسیارانەی لە تەمەنێکی زوودا لـە مێشـکی منداڵـدا دێن و دەچن، ئەو پرسیارانەن، کە دەربارەی خـوای پـەروەردگارن، لێـرەدا زۆرترین پرسیاری منداڵ لەسەر ئەم بابەتە نمایش دەکەین:

### خودا کێیە؟

سەرەتا پێویستە ئێمـە نەوەسـتین، تـا منـداڵ پرسـیارمان لـەبارەی خوداوە لێ دەکات، بەڵکو دەبێت بە شێوەی بەردەوام و لە زۆربەی کاتـدا دەستپێشخەری بکەین لـە قسـەکردن لـەبارەی خـوداوە.. وەڵامدانـەوەی ڕاست بۆ پرسیاری منـداڵ لـەبارەی خـودا، بیروبـاوەڕی یەکتاپەرسـتی و

(١) سەیری (الدعوة مهارات وفنون، شحاتة صقر) بکە، (لا ٣٤٠).

بــاوەڕبوونی بــە خــوای گــەورە ﷻ لــە دڵ و مێشــكی منداڵــدا دادەمەزرێنێت، باشترین ڕێگەش بریتییە لە گۆڕینی بیركردنــەوەی منــداڵ لەبارەی خودا بۆ بیركردنەوەی لــەبارەی دروســتكراوە سەرنجڕاكێشــەكانی، وەك ئاسمان و هەورەكان و ئەستێرەكان و خۆر و مانگ و دەریا و درەخــت و... هتد[١]" بەئاگاهێنانــەوە بەرامبــەر بەخشــش و دیارییــەكانی خــوای گەورە لەسەری، بەوەی دروستی كردووە و ئەندامەكانی پێ بەخشــیوە لــە گوێ و چاو و لووت و زمان و دەست و قاچ و تــەواوی جەســتەی. دەبێــت پێی ڕابگەیەنین ئەم ئاسمانە خوای گەورە دروستی كردووە، ئەم زەوی و دار و درەختانە هەموویان خوای مەزن دروســتی كــردوون، تــا وای لــێ دێــت لەگەڵ ئەم وشانە ڕادێت، كاتێكیش پرسیارمان لێ دەكات خــودا كێیــە؟! زۆر بەئاســانی وەڵامــی دەدەینــەوە، كــە ئــەو زاتەیــە هــەموو شــتێكی دەوروبەرمانی لە بێگیان و گیاندار دروســت كــردووە، لــەم بارەیەیشــەوە نموونەی زۆری پێ دەدەین.

كاتێك پەردەی ئەم جیهانەمان لە ئاسمان و زەوی بۆ منــداڵ لادا، لــە بینینی ئەم سیستم و یاسا ڕێكوپێك و مەحكەمە، ئینجا پێی دەڵێین: ئەم سیستمە دەبینیت؟ داهێنەری ئەم یاسا و ڕێسا و سیســتمە تــەنیا خــوای گەورەیە ﷻ، هەر ئەو زاتەیە هــەموو شــتێكی دروســت كــردووە، هــیچ شتێك نییە لە وێنەی ئەو زاتە و هیچ شتێكیش لەو ناچێت، هەر ئەو بــە سۆز و میهرەبان و ڕۆزیدەرە" خاوەنی چەندان ناو و سیفەتە كە هەموویان ئێجگار جــوانن، بۆیــە ئــەو بەتــەنیا شــایەنی پەرســتنە بــەبێ هاوبــەش بۆبڕیاردان. خوای گەورە منداڵی خۆش دەوێــت و فــەرمان بــە گــەورەكان

---

[١] دەكرێت سوود لە كتێبی (عجائب خلق الله) وەربگیرێت.

دەکات ئاگایان لێیان بێت و کاری چاکە و بەسوودیان لەگەڵ بکەن، چونکە ئەو لێپێچینەوە لە کردەوە باش و خراپەکانمان بە پاداشت و سزا دەکات، پاداشتی چاکەکار بە چاکە و سزای خراپەکاریش بە خراپە دەداتەوە. زۆر بەسوود دەبێت، ئەگەر پوختەکراوی درێژکراوەکەی (کە سورەتی إخلاص)ـە، فێر بکەین، کە باشترین وەڵامی لەبارەی بوونی خودا و سیفەتەکانی لەخۆدەگرێت: (الله) ئەو زاتەیە، کە: (**لَم يَلِدْ وَلَم يُولَد، ولَم يَكُنْ لَهُ كُفُواً أَحَد**)ـە.[1]

واتە: "هیچ کەسی لێ نەبووە و خۆیشی لە کەس نەبووە، هەرگیز هاوتا و هاوشێوە و دەسەڵاتدارێکی تر نییە لە بەرامبەریەوە بوەستێت و هاوشانی بێت".

دەکرێت پرسیارێکی لێ بکەین و بڵێین: "کێ ئەم کراسە جوانەی بۆ کڕییت؟" دەڵێت: "باوکم". "کێ دەتبات بۆ قوتابخانە؟" دەڵێت: "باوکم". "کاتێك نەخۆش دەکەویت کێ دەتبات بۆ لای پزیشك؟" دەڵێت: "باوکم". "کێ لە کاتی پشوودا دەتبات بۆ دەرەوە؟" دەڵێت: "باوکم". "کەواتە ئەوە باوکتە، کە ئەو هەموو ئەرکەی لە ئەستۆ گرتووە؟" دەڵێت: "بەڵێ". بەم شێوەیە خوای گەورەیش ئەرکی هەموومانی لە ئەستۆ گرتووە، هەموو شتێکی دروستکردووە، هەرچی تۆ دەیبینیت لە دەوروبەرتدا دروستکراوی زاتی (**الله**)یە" خۆر و مانگ، هەور و دەریا و شاخەکان، مرۆڤ و گیاندار و باڵندەکان، فریشتە و پەرییەکان،

---

[1] سەیری (وسائل التربية الإيمانية في ضوء العلم والفسلفة والغسلام، د. مقداد يالجن) بکە، گۆڤاری (المسملم المعاصر) ژمارە (٥). هەروەها سەیری (المربون وتساؤلات الأطفال، وال الخليفة) بکە، (لا ٣٢). سەیری (القرآن الكريم رؤية تربوية، د. سعيد علي) بکە، (لا ١٩).

خـودای موتـەعال بەدیهێنـەری هـەموو گەردوونـە. خـوای بەخشـندە و میهرەبان کاروبارەکانمان هەڵدەسووڕێنێت و ئاگای لێمانە، ئێمـەی خـۆش دەوێت و بەردەوام خێر و چاکەمان دەهێنێتەڕێ.

## ئایا شێوەی خودا وەك شێوەی مرۆڤە؟

نا، نەخێر وەك ئێمە نییە، هیچ شتێك وەك ئەو نییە و لـەو ناچـێت. ئەو زاتە من و تۆ و هەموو خەڵك و شتێکی دروستکردووە، دار و درەخت و ڕووبار و دەریاکان و هەموو شتی دروستکردووە. ئەو سەرچاوەی هێـزە، هەر شتێکی بوێت بیکات، پێی دەڵێت: (ببە) ڕاستەوخۆ دەبێت. (**الله**) بە مرۆڤ ناچێت، مرۆڤ ناتوانێت مرۆڤێکی تـر دروسـت بکـات، بـەڵام (**الله**) توانای هەموو شتێکی هەیە و هەرشتێکی بوێت دەیکات.

هیچ کەسێك لـە دونیـادا ناتوانێـت خـودای مـەزن ببینێـت، کـەس ناتوانێت وەسفی شێوەی ئەو بکات، ئێمـە لەبـەر نـوور و ڕووناکییەکـەی ناتوانین سەیری خودا بکەین، تواناکانمـان سـنووردارن... پاشـان داوا لـە منداڵەکە دەکەین بچێت سەیری تیشکی خـۆر بکـات بـێ ئـەوەی چـاوی دابخات، لێی دەپرسین: "دەتوانیت بە بەردەوامی سەیری خۆر بکەیت؟" بە نەخێر وەڵام دەداتەوە. پێی دەڵێن: "خۆشەویستەکەم! خوای گەورەیش بەم شێوەیەیە، ناتوانین بەرگەی ئەو نوور و ڕووناکییە بگرین، کـە لـە خـوای گەورەوە دەردەچێت، بەڵام کاتێك دەچینە بەهەشت ئەوکات بە پشـتیوانی و ویستی خوا دەتوانین ئەو زاتە پیرۆزە ببینین.

لەوانەیە منداڵ ناڕازی دەرببڕێت و وا دەربخـات بـڕوای پێـی نییـە و بڵێت: "چۆن هیچ شتێك وەك ئـەو نییـە؟" لێـرەدا پێویسـتە بەهێواشـی

بڕوای پێ بهێنین، بڵێین: "عەقڵمان هەرچەند گەورە بێت و تێبگات، هەر بە عەقڵی مرۆڤی سنووردار دەمێنێتەوە، هەرشتێك خوا حەز بکات ئێمە فێری دەبین، ئەوەیشی نەیەوێت، ئێمە لێی نازانین. زۆر ئەستەمە هەموو شتێك بزانین، چونکە هەر بە مرۆڤی دەمێنینەوە". ئینجا پێی بوترێت: "ئەگەر خوای گەورە وەك ئێمەی مرۆڤ بوایە، نەخۆش دەکەوت، وەك ئێمە خواردن و خواردنەوەی دەخوارد، وەك چۆن مرۆڤ دەمرێت ئەویش دەمرد، بەڵام خوای گەورە نە نەخۆش دەکەوێت" نە دەخوات و دەخواتەوە، نەدەیشمرێت. ئەو زاتە بەردەوام بوونی هەیە، بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی و هەموو گەردوونە، بۆیە دەڵێین هیچ شتێك لەو ناچێت و وەك ئەو نییە".

دەتوانین پرسیار لە منداڵ بکەین: "ئایا ئێمەی مرۆڤ دەتوانین بە شتێك بڵێین (ببە) و ڕاستەوخۆ ببێت؟ لەوەڵامدا دەڵێت: "نەخێر"، بەم شێوەیە لەگەڵ منداڵ ئەو وەڵامە بەرهەم دەهێنین، کە هیچ شتێك وەك (اللّه) نییە و لەو ناچێت، بەڵکو ئەو بەدیهێنەری گەردوون و هەموو شتێکە.

ئینجا پێی دەڵێین: "توانای بیستنمان سنووردارە، ناتوانین هەموو دەنگێك ببستین، تەنیا لە مەودایەکی دیاریکراودا نەبێت، ئەگەر هەموو شتێکمان ببیستایە ماندوو دەبووین. توانای بینینمان سنووردارە، ناتوانین هەموو شتێك بینین، تەنیا لە مەودایەکی دیاریکراودا نەبێت، بۆ نموونە: ناتوانین پشتی دیوار ببینین. وەك چۆن بیستن و بینینمان سنووردارە، بە هەمان شێوە عەقڵیشمان سنووردارە و دەرك بە هەموو شتێك ناکات.

لەوەتەی مرۆڤایەتی دروست بووە، تا دەگاتە ئێستا ماوەیەکی

ئێجگار زۆر هەیە نەزانراوە و هیچ زانیارییەکمان لەبارەیەوە نییە، بۆ نموونە: ڕۆح، کە لە جەستەی مرۆڤدایە، هەرچەندە تەواو نزیکە لێمانەوە، بەڵام ناتوانین وێنای بکەین و حەقیقەتەکەی بزانین" ئەمە لە کاتێکدا لەناو خودی خۆماندایە، چ بگات بە جیهانی دەرەوەمان! بۆیە مادام عەقڵی مرۆڤ سنوورداره و ناتوانێت دورك بە زاتی (الله) بکات، لەبەر ئەوە قسەکردن لە بارەی شێوەی خوای گەورە نە بە وێنەگرتن و نە بە عەقڵ و نە بە خەیاڵیش دەبێت، بەڵکو تەنیا بە شەرع (ئایین) دەبێت، قورئانی پایەبەرز ئەم کێشەیەی بۆ یەکلاکردووینەتەوە و دەفەرموێت: ﴿ لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌۭ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴾ الشورى: ١١

واتە: "هیچ شتێك نییە لە وێنەی ئەو زاتە، هیچ شتێك لەو ناچێت، هەر ئەویش بیسەر و بینایە". بەم پێیە، بەدڵنیاییەوە خوای گەورە وەك ئێمە نییە، وەك هیچ شتێکی تری نییە.[1] ئەمەیش بەڵگەیە لەسەر گەورەیی و پیرۆزیی (الله)، کە پێویستە لەسەرمان خۆشمان بوێت و لێی بترسین و ئومێدیشمان پێی هەبێت. ئەم گەورەیی و پیرۆزییەیشمان لە بەهەشتدا بۆ دەردەکەوێت، بینینی (الله) گەورەترین بەخششەکانی بەهەشتە بە ڕەهایی".

---

[1] سەیری (كيف أُجيب عن أسئلة طفلي؟ مروة عاشور) بکە لە ماڵپەری (الألوكة)، ١٤٣٢/٢/١٩ سەیری (ابني مكتشف كيف أعينه على اكتشافه، منصور السني) بکە، (لا ٣٠). سەیری (كيف أُجيب عن أسئلة طفي وأحاوره، د.سلوى مرتضى) بکە، (لا ١٠٧). سەیری (الأسئلة العقائدية عند الأطفال والإجابة عليها، د.بسام العموش) بکە، (لا ٣٠، ٣١).

## کێ خودای دروستکردووە؟

گەر کەسێك هەبوایە خودای دروست بکردبایە، ئەوکات پرسیارێکی دیکە دەکرا: ئەی کێ ئەم کەسەی دروست کردووە؟ وانییە؟ کەواتە پێویستە بزانین سیفەتەکانی بەدیهێنەر وەك بەدیهێنراو نییە، ئەو هەموو دروستکراوەکانی دروستکردووە، ئەگەر ئەویش دروستکراو بوایە نەماندەپەرست و ملکەچی فەرمان و ڕێنماییەکانی نەدەبووین. پرسیارکردن لەبارەی ئەوەی کێ خودای دروستکردووە شتێکی ڕاست نییە، هەر پرسیارێکیش ڕاست نەبێت، هیچ مانایەکی نابێت، بۆ نموونە: ئەگەر کەسێك پرسیارت لێ بکات و بڵێت درێژیی هێڵی چوارەمی سێگۆشە چەندە؟ هیچ بوارێك نییە بۆ ئەوەی وەڵامی ئەم پرسیارە بدرێتەوە، چونکە سێگۆشە تەنیا سێ لای هەیە، بۆیە هەمان هەڵەیش لەو پرسیارەدا هەیە، کە کێ خودای دروستکردووە؟ هەر دوو وشەی (دروستکردن) و (خودا) پێکەوە کۆنابنەوە، چونکە خودای پەرستراو دروست نابێت، کرداری دروستکردن تەنیا بەستراوەتەوە بە دروستکراوەوە. هیچ کەسێك ناتوانێت خودای مەزن بەدی بهێنێت، گەر وا بوایە ئەوکات خودایش دروستکراو دەبوو. خودای گەورە بەردەوام بوونی هەیە و سەرەتا و کۆتاییشی نییە (ئەزەل و ئەبەدە).

ئەگەر وا دابنێین - مشتومڕێك بنێینەوە - بەدیهێنەرێك هەیە خوای دروست کردووە، ئەوکات پرسیارەکەی پێشوو هەر دەمێنێتەوە، ئەی کێ بەدیهێنەری خودای دروستکردووە؟! پاشان ئەی کێ بەدیهێنەری بەدیهێنەری خودای دروست کردووە؟ پاشان...؟؟!! ئەمە سەردەکێشی تبۆ ناکۆتا، ئەمەیش ئەستەمە، بۆ ڕوونکردنەوە. نموونەی سەربازێك و

تەقاندنی گوللە وەردەگرین، سەرباز دەیەوێت گوللە بتەقێنێت، بەڵام بۆ ئەو کارە پێویستی بە وەرگرتنی فەرمان هەیە لە ئەفسەری سەرووی خۆیەوە، ئەفسەرەکەیش بۆ فەرماندان پێویستی بە وەرگرتنی فەرمان هەیە لە سەرووی خۆیەوە، بەم شێوەیە دەبێتە شتێکی ناکۆتا. ئایا سەربازەکە گوللەکە دەتەقێنێت؟ نەخێر، چونکە ناگاتە ئەو ئەفسەرەی فەرمانی تەقاندنی گوللەکە دەربکات، بەڵام ئەگەر زنجیرەکە لە کەسێکدا وەستا، هیچ کەسێکی گەورەتر لە سەرووی ئەوەوە نەبێت بۆ ئەوەی فەرمان دەربکات" ئەوکات گوللەکە دەتەقێت، وەلێ، هەتا کەسەکان زۆرترین گوللەکە ناتەقێت، ئەم هەموو سەرباز و پلەدارەیش وەك زیادکردنی ئەو سفرانە وان، ئەگەر لە تەنیشت یەکتر دابنرێن، تا زۆرترین و بێسنوورین" هەر یەکسانە بە هیچ، مەگەر ئەوەی لە پێشی سفرەکانەوە ژمارە (١) دابنێیت.[1]

## خودا لە کوێوە هاتووە؟ تەمەنی چەندە؟

ئەی خۆشەویستەکەم! مادام دەزانیت خوای گەورە دروستکراو نییە، بۆیە هیچ کەسی لێ نەبووە و خۆیشی لە کەس نەبووە، نە سەرەتای هەیە و نە کۆتایی، کەواتە تەمەنیش بۆ ئەو هیچ نییە وەك ئەوەی ئێمەی مرۆڤ هەمانە، چونکە خوای پەروەردگار بەدیهێنەری پیرۆزی بێنیازی خاوەن دەسەڵاتی ڕەهایە" بەسۆز و میهرەبان و باڵادەستە، ناوە پیرۆز و جوانەکان

---

[1] سەیری (الأسئلة العقائیدة عند الأطفال والإجابة علیها، د. بسام العموش) بکە، (لا ٢٩). سەیری (الملحد وسؤاله الخاطئ من خلق الله، د. ربیع أحمد) ماڵپەری (الألوكة)، مێژووی بڵاوکردنەوە ١٤٣٦/٥/١٨. هەروەها سەیری (اسئلة طفلك الحرجة، أبو المجد حرك) بکە، (لا ٢٤). سەیری (شموع النهار، عبدالله العجیري) بکە، (لا ١٥١).

و سیفەتە بەرزەکان هەموویان شایستەی ئەون، خاوەن هەموو سیفەتێکی تەواوە و کەموکوڕیی نییە، هەر ئەو زاتەیە بوونەوەر و سەرجەم دروستکراوەکانی بەدیهێناوە.

## کێ پێش خودا هەبووە؟

ئەوە هەمان ئەو پرسیارەیە (کێ خودای دروست کردووە؟)، پرسیارێکی هەڵەیە، خوای گەورە سەرەتایە و هیچ شتێك پێش ئەو بوونی نەبووە، هەر خۆیشی کۆتا شتە و دواهەمینە هیچ شتێك دوای ئەو بوونی نابێت[1]" پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ هُوَ ٱلۡأَوَّلُ وَٱلۡأٓخِرُ وَٱلظَّٰهِرُ وَٱلۡبَاطِنُۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ ﴾ الحديد: ٣

واتە: "ئەو خوایە، یەکەمینە و لە سەرەتاوە هەر هەبووە و کەس پێش ئەو نەبووە، دواهەمینە و کۆتایە، کەس دوای ئەو نامێنێت" هەروەها ئەو زاتە دیارە و هەموو شت بەڵگەیە لەسەر بوونی، لە هەمان کاتدا زاتی خۆی نادیارە و هەر خۆیشی زانایە بە هەموو شتێك".

کات و شوێن بۆ خوای گەورە بوونیان نییە، کاتیش بەدەر نییە لەوەی دروستکراوێك بێت لە دروستکراوەکانی تر، ناکرێت دروستکراو بگاتە ئاستی دروستکار، خوای مەزن خاوەنی هەموو سیفاتە تەواو و کەماڵەکانە. بۆ ئەم بابەتە پێویستە لێرەدا گوێبیستی ئامۆژگارییەکی پێغەمبەر ﷺ بین، (ابو هريرة) رضي الله عنه لە پێغەمبەرەوە ﷺ بۆمان

[1] سەیری (الأسئلة العقائدية عند الأطفال والإجابة عليها، د. بسام العموش) بکە، (لا ٤٩).

دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (**شەیتان دیتە لای یەکێکتان و پێی دەڵێت: کێ ئەمەی دروست کردووە؟ ئەی ئەمە کێ دروستی کردووە؟ تا دەگات بەوەی دەڵێت: ئەی کێ خوای دروست کردووە؟ ئەگەر گەیشت بە ئەمە، با پەنا بگرێت بە خوای گەورە لە شەیتانی نەفرینکراو و ئینجا واز بهێنێت**).[1] پاشان پەناگرتن بە خودا و ئاراستەکردنی منداڵ بۆ بابەتێکی تر بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بۆ ئەوەی درێژە بەم جۆرە پرسیارانە نەدات... گۆڕینی بیرکردنەوەی منداڵ لەم بابەتە، مانای ئەوە نییە، کە وەڵام بۆ ئەم پرسیارە نییە، بەڵکو بریتییە لە داخستنی دەرگاکانی وەسوەسە.

## ئایا خودای گەورە نێرە، یان مێیە؟

پێوستە هەوڵ بدەن مێشکی منداڵ بەدوور بگرین لە بیکردنەوە لە زاتی (الله)، وای لێ بکەین بیر لە شتێکی تر بکاتەوە، کە سوود و قازانجی هەبێت، لێرەدا پێویستە بۆ منداڵ ڕوون بکەینەوە بابەتی نێر و مێ لە پێویستییەکانی جیاکردنەوەی نێوان جۆر و ڕەگەزی دروستکراوە زیندووەکانە" لەو بەخششانەیە خوای گەورە بە دروستکراوەکانی خۆی بەخشیوە، وەك دەفەرموێت ﴿ وَأَنَّهُۥ خَلَقَ ٱلزَّوۡجَيۡنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلۡأُنثَىٰ ﴾ النجم: ٤٥.

خوای پەروەردگار لە سەرووی ئەو جیاکارییەیە، بەڵکو تەنانەت دروستکراوی تریش هەیە ئەم جیاکارییەی نییە، وەك فریشتەکان، تەنانەت ئاسمان و هەوا و ئاو و هەورەکانیش بە نێر و مێ وەسف ناکرێن.

---

[1] بوخاری گێڕاویەتییەوە (٣٢٧٦).

جا ئەگەر دروستکراوی ناتەواو ئەم جیاکارییەی نەبێت، ئەوا خوای گەورە زۆر لە پێشتر و پاکترە لەوەی، کە پێویستی بەم جیاکارییە بێـت: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ﴾ الشورى: ١١ ،

## بۆچی باوەڕ بە بوونی خودا دەهێنین، چ شتێك بوونی خودا دەسەلمێنێت؟

بـاوەڕبوون بـە خـودا، فیترەتێکـی خۆڕسـکی مرۆڤایەتییـە، کـەس ناتوانێت نکۆڵیی لیّ بکات. بەڵگەکانی بـوونی خـودا زۆرن، ئێستایشـی لەگەڵ بێت مرۆڤەکان هەریەکەیان بەگوێرەی پسـپۆڕییەکەی بەڵگـە دوای بەڵگە دەدۆزنەوە، بەڵگە خۆڕسکەکانی خـودی مـرۆڤ سـەلمێنەری بـوونی خودای مەزنن: ﴿فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا﴾ الروم: ٣٠.

هەر یەکێك لە ئێمە هێزێکی لە ناوەوەی خۆیدا هەیە، کە هەستی پیّ دەکات و ئاماژە بە گەورەیی و هێز و ئاگاداربوونی خوای گەورە دەکـات. بەڵگە زانستی و هەستییەکان جەخت لە بوونی سیستمێکی ورد و تۆکمـە لە گەردووندا دەکەنەوە، ئەم سیستمە ورد و تۆکمەیەیش بێگومان دەبێت دروستکارێکی هەبێت، ئایا کیّ ئەو هەموو دروسـتکراوەی بـەدیهێناوە؟ یان ئەوەتا بەڕێکەوت دروست بوون بەبیّ هیچ هۆکارێك، ئـەوکات کـەس نازانێت چۆن بەدیهاتوون، ئەمەیان ئەگـەری یەکـەم.. ئەگـەرێکی تـریش هەیە و بریتییە لەوەی، کە: ئەم هەموو شتە خۆیان خۆیان دروست کردووە و کاروبارەکـانی خۆیـان بـەڕێوە دەبـەن.. ئەگـەری سـێیەمیش دەڵێـت: بەدیهێنەرێك هەیە بەدیی هێناون، یان دروسـتکارێك دروسـتی کـردوون.

کاتێك بەوردی سەیری هەر سێ ئەگەرەکە بکەین، دەبینین ئەگەری یەکـەم و دووەم مەحاڵن، ئەگەر ئەگەری یەکەم و دووەم نەبێت، ئەوکات ئەگـەری سێیەم ڕاست دەردەچێت، کە بەدیهێنەر و دروسـتکارێك هەیـە دروسـتی کردوون - ئەویش (اللە)-یە" هەر ئەمەیشە لە قورئانی پیرۆزدا باسـکراوە وەك پەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿ أَمۡ خُلِقُواْ مِنۡ غَيۡرِ شَيۡءٍ أَمۡ هُمُ ٱلۡخَٰلِقُونَ ۝٣٥ أَمۡ خَلَقُواْ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَۚ بَل لَّا يُوقِنُونَ ﴾ الطور: ٣٥- ٣٦

واتە: "ئایـا ئەوانـە بـەبێ هـیچ شـتێك، هـیچ هۆیـەك، هاتوونەتـە کایەوە؟! یان هەر خۆیان دروستکارن؟! یان ئـەو بێباوەڕانـە ئاسمانـەکان و زەوییان دروستکردووە؟ نەخێر، ئەوانە هەر دڵنیانابن".

هەر لە بەڵگە هەسـتییەکانی بـوونی خـودا، وەڵامدانـەوەی خـودای مەزنـە بـۆ داوا و نزاکـان، هـەروەها جـوان دروسـتکردنی ئاسمانـەکان و زەوییـــە، وەك دەفـــەرموێت: ﴿ إِنَّ فِي خَلۡقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱخۡتِلَٰفِ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ لَأٓيَٰتٖ لِّأُوْلِي ﴾ آل عمران: ١٩٠

واتە: "بەڕاستی لە دروستکردنی ئاسمانـەکان و زەوی و لـە ئـاڵوگۆڕی شەو و ڕۆژدا، بەڵگە و نیشانەی زۆر هەن بۆ کەسـانی ژیـر و هۆشمەنـد". یـاخود جـوان و ڕێکوپێـك دروسـتکردنی مرۆڤـەکان: ﴿ وَفِيٓ أَنفُسِكُمۡۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ ﴾ الذاريات: ٢١، یـان لـە دروسـتکردنی ئەسـتێرە و کـەژ و کێـو و گیانداران و ئەوانیتر، هەموویان بەڵگەن لەسەر داهێنانی بەدیهێنەر ﷻ. بەڵگـــە و نیشـــانەکانی خـــوای گـــەورە لـــە ئاســـۆکان و بوونـــەوەر و بەروبوومـەکاندا بڵاوبوونەتـەوە، سـەرجەمیان بەڵگـەی بـوونی خوایـەکی بەدیهێنەری تاك و تەنیان، بێگومان دەبێت هەموو ئەم دروستکراوانەیش

ئامانجێکیان هەبێت، ئەویش بریتیە لە پەرستنی خودای تاك و تەنیا و بێ هاوبەش.[1] دەکرێت لێرەدا چیرۆکی ئەبو حەنیفەی ﷺ بۆ بگێڕینەوە، کاتێك هۆزێك داوایان لێ کرد یەکتایی خوایەتی بسەلمێنێت، پێی وتن: "پێش ئەوەی باس لەم بابەتە بکەین، پێم بڵێن، کە بەلەمێك لە ڕووباری دیجلە دەپەڕێتەوە و دەچێت و پڕ دەبێت لە خواردن و کەلوپەل، لەخۆیەوە هاتوچۆ دەکات بێ ئەوەی کەس ئەم کارە بکات؟" وتیان: "ئەم کارە ئەستەمە و قەت ڕوونادات". ئینجا ئەویش پێی وتن: "ئەمە ئەگەر بۆ بەلەمێك ئەستەم بێت، ئەی چی دەڵێن لەبارەی ئەو هەموو جیهانە بە گەورە و بچووکییەوە؟!"[2] بۆیە مەحاڵە و شتی وا ڕوونادات، کە ئەم بوونەوەرە ڕێکوپێکە بەبێ بوونی بەدیهێنەر و دروستکارێکی بەتوانا و زانا هاتبێتە بوون.

هەروەها دەتوانرێت بوترێت، کاتێك لە سکتدا هەست بە ئازار دەکەیت، ئایا وا هەست ناکەیت برسیتە و لەخۆتەوە بە دوای خواردندا ناگەڕێیت بۆ ئەوەی خۆت تێر بکەیت؟ کاتێك هەست بە تینوویێتی دەکەیت، ئایا ناگەڕێیت بۆ ئەوەی تینوویێتیت بشکێنیت؟ کاتێك هەست بە بۆنێکی خۆش دەکەیت، هەست بە دڵخۆشی ناکەیت؟ بەپێچەوانەوە بۆ بۆنی ناخۆشیش؟ کاتێك سەیری گوڵ و گوڵزار و ئاسمان و سروشتی

---

[1] سەیری (الأسئلة العقائدیة عند الأطفال والإجابة علیها، د.بسام العموش) بکە، (لا ٢٥٣). سەیری (أفي الله شك، د. حمد المزروقي) بکە، (لا ٢٥٣). هەروەها سەیری (الأدلة علی وجود الله والحکمة من خلقه للعباد) بکە، ماڵپەری (ئیسلام و جواب)، مێژووی بڵاوکردنەوە (٢٠٠٢/٤/٧)" هەروەها سەیری (الله کتاب في نشأة العقدیة الإلهیة، عباس العقاد) بکە، (لا ٢١١، ٢٢٢).

[2] سەیری (شرح العقیدة الضحاویة، ابن أبي العز الحنفي، تحقیق أحمد شاکر) بکە، (لا ٣٥).

دەوروبەر دەکەیت، هەست بە دڵخۆشی و ئاسوودەیی ناکەیت؟ بەم شێوەیە - ئەی خۆشەویستەکەم! - ئێمە هەر لەخۆوە هەست دەکەین، کە بەردەوام پێویستمان بە خودایەك هەیە پەنای بۆ ببەین، بۆ ئەوەی هەست بە ئارامی و ئاسوودەی بکەین، بۆیە هەر کاتێك هەست بە دڵتەنگی و نیگەرانی دەکەین" لەخۆوە پەنا بۆ (الله) دەبەین و داوای لێ دەکەین، هەرکاتێکیش هەستمان بە ئاسوودەیی کرد سوپاسی خودای لەسەر دەکەین.

## ئایا خودای گەورە وەك ئێمە دەبینێت و دەبیستێت و قسە دەکات؟

خوای گەورە قسە دەکات و دەبیستێت و دەبینێت، وەك خۆی دەفەرموێت: ﴿ قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى تُجَٰدِلُكَ فِى زَوْجِهَا ﴾ المجادلة: ١

واتە: "بێگومان خوا بیستی و وەریگرت وتووێژی ئەو ئافرەتەی، کە گفتوگۆت لەگەڵدا دەکات دەربارەی هاوسەرەکەی"، هەروەها بە پێغەمبەر موسا و هاروون - سڵاوی خوایان لەسەر بێت - دەفەرموێت: ﴿ قَالَ لَا تَخَافَآ ۖ إِنَّنِى مَعَكُمَآ أَسْمَعُ وَأَرَىٰ ﴾ طه: ٤٦

واتە: "مەترسن من بەڕاستی لەگەڵتاندام، دەبیستم و دەبینم". یاخود دەفەرموێت ﴿ إِنَّهُۥ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾ هود: ١١٢

واتە: "بەڕاستی ئەو زاتە زۆر بینایە بەو کردەوانەی، کە دەیکەن". بەڵام وەك قسە و بیستن و بینینی ئێمە نییە، چونکە خوای گەورە جیاوازە لە دروستکراوەکانی، ئەو گوێبیستی دەنگەکان دەبێت گەرچی بزر و

شاراوەیش بن، شتەکان دەبینێت گەرچی دوور و شاراوەیش بن" بۆیە خوای گەورە هەموو شتێك دەبیستیت و هەموو شتێك دەبینێت، بەڵام بیستن و بینینی وەك بیستن و بینینی دروستکراوەکانی نییە، بەوپێیەی ئەوان کەموکورییان هەیە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴾ الشورى: ١١.

وا باشترە دایکان و باوکان ئەم بابەتە ببەستینەوە بە ڕەفتاری ڕاستەوخۆوە، بڵێین مادام خوای گەورە بیسەر و بینەرە، ئایا لێمان دەوەشێتەوە قسەیەك بکەین، یان کردەوەیەك ئەنجام بدەین ئەو پێی ناخۆش بێت" لە کاتێکدا بەو حاڵەوە دەمانبینێت و قەبووڵیشی نییە؟[1]

## ئایا خودای گەورە برسی و تینوو نابێت؟

(اللە) ﷻ خاوەن سیفەتی کەماڵ و تەواوییە و دوورە لە کەموکوڕی، برسێتی و تێنوێتی نیشانەی بوونی کەموکوڕین، ناکرێت کەموکوڕی بدرێتە پاڵ خودای موتەعال، بەوپێیە پێویستی بە خواردن و خواردنەوە نییە[2]، چونکە خودا بەدیهێنەری هەموو شتێکە و پێویستی بە هیچ شتێك نییە" ئەگەر پێویستی بە هەر شتێك بوایە، ئەوکات نەدەکرا خودا بوایە. خودا (الصمد)ـە، زاتێکی پایەداری دەسەڵاتدارە، نیازی بە هیچ

---

[1] سەیری (الأسئلة العقائدية عند الأطفال والإجابة عليها، د. بسام العموش) بکە، (لا ٢٥٣). هەروەها سەیری (القرآن الكريم رؤية تربوية، د. سعيد علي) بکە، (لا ٤٣)، هەروەها سەیری (أسئلة وأجوبة الآباء والأمهات، مجدي السيد) بکە، (لا ٢٢).

[2] سەیری (الأسئلة العقائدية عند الأطفال والإجابة عليها، د. بسام العموش) بکە، (لا ٣٥).

کەسێك و هیچ شتێك نییە و هەموو کەس و شتێك ئاتاجی ئەون بۆ ئەوەی ڕزق و ڕۆزی و خواردنیان پێ بدات و داواکانیان جێبەجێ بکات.

دەتوانین بڵێین، ناشێت بەراورد لە نێوان دورستکار و دروستکراودا بکرێت، مەرج نییە هەر شتێك دابهێنین، یان دروستی بکەین هەمان شێوە و سیفەتی ئێمەی هەبێت، ئەی وا نییە؟ خوای گەورە نە برسیی دەبێت و نە تینوو. بوارم بدە پرسیارێکت لێ بکەم: کێ پاسکیلی دروستکردووە؟ وەڵام دەدەیتەوە، کە: دروستکاری پاسکیل، دروستی کردووە. باشە، وەرە - کوڕەکەم- با بەیەکەوە بیر بکەینەوە، ئایا پاسکیل قسە دەکات و پرسیار لە دروستکارەکەی دەکات کە چی دەخوات؟ چی دەخواتەوە؟ چی پێ دەڵێیت؟ پێی دەڵێم: ئەمە کاری تۆ نییە، چ سوودی هەیە، ئەگەر بزانیت؟ هیچ لە کاری تۆ دەگۆڕێت، کە بریتییە لە لێخوڕین بەخێرایی و بەبێ لەکارکەوتن؟ باشە، ئێمەیش بەم شێوەیە - ئەی کوڕەکەم! - بۆ ئەرکێکی دیاریکراو دروستکراوین: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾ الذاريات: ٥٦

واتە: "بێگومان من پەری و ئادەمیزادم دروست نەکردووە تەنیا بۆ ئەوە نەبێت، کە بمپەرستن و فەرمانبەردارم بن".

ئەم جۆرە پرسیارانە هیچ سوودمان پێ ناگەیەنن و لە ڕاپەڕاندنی ئەرکەکەمان، کە لەپێناویدا دروست بووین یارمەتیمان نادەن، تەنانەت بەپێچەوانەوە مێشکمان بەرەو شتێکی تر سەرقاڵ دەکەن، کە لە ئەرکەکەمان دوورمان دەخەنەوە.. بەڵام چ کاتێك پاسکیلەکە بەرەو ڕوومان دێت و پرسیارمان لێ دەکات؟ ئەو کاتەی تووشی لە کارکەوتن

دەبێت، ڕوو دەکاتە دروستکارەکەی بۆ ئەوەی کێشەکەی بۆ چارەسەر بکات، ئەی وا نییە؟ بۆیە ئێمە کاتێك لە پەرستن کەموکوڕیمان تووش دەبێت، یان تووشی زیان و ناخۆشییەك دەبین، بە نزاکردن و پاڕانەوە پەنا دەبەینە بەر خوای پەروەردگار.

## هێزی خودای گەورە چەندە؟

گەر ئێمە باس لە هێزێك، یان توانایەکی دیاریکراو بکەین، واتە ئێمە باس لە سیفەتێکی کەموکوڕی دەکەین، چونکە کۆتایی هێز سەرەتایی بێهێزییە، سیفەتی بێهێزی بۆ خوای گەورە نابێت" بۆیە توانای خوای گەورە بێسنوورە، هیچ شتێك بەربەست نییە بەرامبەر تواناکانی، وەك دەفەرموێت: ﴿ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴾ البقرة: ١٠٦

واتە: "خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە"، ئەگەر ویستی هەبێت شتێك بکات، پێی دەڵێت (ببە) و دەبێت، توانای ڕەهای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، چونکە بەدیهێنەری هەموو شتێکە، هیچ شتێك نە لە ئاسمان و نە لە زەوی بەدەر نییە لە تواناکانی ئەو زاتە. توانای دروستکراو توانایەکی سنووردارە، چونکە تواناکەیشی دروستکراوە، بەڵام توانای دروستکار نە سنووری هەیە و نە کەموکوڕی، هەر لەبەر ئەمەیشە، کە خوای گەورە بەتەنیا شایەنی پەرستن و نزا و پاڕانەوەیە، چونکە هەر خودی خۆیەتی، کە وەڵامی پێویستی و نیازمەندیی خەڵك دەداتەوە و حەز و ئارەزووەکانیان دەهێنێتە دی و کاروباریان ڕادەپەڕێنێت.[1]

[1] سەیری (الأسئلة العقائدية عند الأطفال والإجابة عليها، د. بسام العموش) بکە، (لا ٣١). هەروەها سەیری (مختصر الفقة الإسلامي، محمد التويجري) بکە، (لا ٥٨).

## خودا لە کوێیە؟ قەبارەی چەندە؟

دوای ئەوەی منداڵ زوو تێگەیشت، کە (الله) ئەوی دروستکردووە و زۆریش منداڵی خۆش دەوێت، بەخششەکانی ئێجگار زۆرن، ئەوکات دەتوانین بۆی شی بکەینەوە، کە خوای گەورە لە ئاسمانە، وەك دەفەرموێت ﴿ ءَأَمِنتُم مَّن فِي السَّمَاءِ ﴾ الملك: ١٦، بەڵام دەسەڵات و کاروبارەکانی لە هەموو شوێنێکە، وەك دەفەرمویت ﴿ وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ ﴾ الحديد: ٤

واتە: "لە هەر شوێنێك بن ئەو زاتە لەگەڵتاندایە و پێتان دەزانێت".

ناکرێت ئێمە بڵێین خوای گەورە لە هەموو شوێنێکە، چونکە ئەمە واتای وایە ئەو زاتە لەناو هەموو شتێکدایە، ئەمەیش ڕاست نییە. ئێمە پابەندین بەوەی لە سوننەتدا هاتووە، لە فەرموودەی شەریفدا هاتووە، کە: (پێغەمبەری ﷺ لە کیژۆڵەیەکی کۆیلەی پرسی **خوا لە کوێیە؟** وتی: لە ئاسمانە. ئینجا فەرمووی **من کێم؟** وتی: تۆ پێغەمبەری خوایت. فەرمووی: **ئازادی بکەن، ئەمە بڕوادارە**).[1]

بۆیە پەروەردگار لەگەڵ ئەوەی لە ئاسمانە، بەڵام دەتوانێت بمانبینێت و گوێبیستمان بێت لە هەر شوێنێك بین. پێویستە منداڵ دڵنیابکەینەوە لەوەی، کە خوای گەورە بەردەوام ئاگای لێیەتی، ئەوکات بەربەستێکی دەروونی لەناوەوەیدا گەشە دەکات، خودچاودێری تاکە سەرچاوەی دەبێت.

بەڵام سەبارەت بە قەبارەی ئەو زاتە: پەروەردگار لەگەڵ هیچ شتێکی تر بەراورد ناکرێت، لە هەموو شتێك گەورەترە، لە هەموو

---

[1] موسلیم گێڕاویەتییەوە (٥٣٧).

دروستکراوەکانیش، گەر دروستکراوەکان گەورەبن، ئەوا دروستکارەکەیان ئێجگار گەورەترە. هەر ئەو زاتەیە ﷻ کەژ و کێوەکان لە ڕەگوڕیشە هەڵدەتەکێنێت و وردوخاشیان دەکات، دەریاکان دەهێنێتە جۆش، فەرمان بە ئاو دەکات بە زەویدا ڕۆبچێت، لە گەردووندا هەرچی ڕوودەدات بە ویست و فەرمانی ئەوە. خودا هیچ پێویستی بە دروستکراوەکانی نییە، ئاسمانیش یەکێکە لە دروستکراوەکانی ئەو، هیچ پێویستی پێی نییە، چونکە پەروەردگار بێنیازە لە گشت شتێك.[1]

## چۆن خودای گەورە ئێمە دەبینێت، بەڵام ئێمە نایبینین؟

هەستی بینین، کە خوای گەورە لەم ژیانەدا پێی بەخشیوین زۆر بێهێزە و گەلێك شت هەن ناتوانین بیانبینین، بۆیە مرۆڤ بۆ بینینی هەندێ شت ئامێری وردبین و مایکرۆسکۆب بەکاردەهێنێت، ئەمە ئەگەر مرۆڤ توانای بینینی دروستکراوەکانی نەبێت" ئەی سەبارەت بینینی خوای پەروەردگار چی؟!! توانای مرۆڤ لە دونیادا یارمەتیی نادات بۆ بینینی خودا، ئێمە ناتوانین خودا ببینین، بەڵام بڕوامان پێی هەیە، بڕوامان پێیەتی، کە بەسۆز و میهرەبانە و خۆشی دەوێین" بەتوانا و باڵادەستە بەسەر هەموو شتێکدا، ئاگاداری هەموو شتێکە، ئاگاداریشە بەوەی، کە ئێمە ئێستا لەبارەی ئەوەوە قسە دەکەین. خوای پەروەردگار زۆر لە سەرووی ئێمەوەیە، بۆیە لە یەك کاتدا هەموومان دەبینێت، وەك کەسێك بچێتە سەر باڵاخانەیەك و سەیری خوارەوە بکات هەموو خەڵکی خوارەوە

---

[1] سەیری (الأسئلة العقائدية عند الأطفال والإجابة عليها، د.بسام العموش) بکە، (لا ٣٢، ٤٥).

دەبینێت، بەڵام خەڵك نایبینن" خودای موتەعالیش ئێمە دەبینێت، وەلێ ئێمە ئەو نابینین. زۆر شت هەن، کە ناتوانین بیانبینین و بوونیشیان هەیە...

بە منداڵ دەڵێین: چاوەکانمان ناتوانن هەموو شتێك ببینن، ئێمە (دەنگ) نابینین لە کاتێکدا دەیبیستین، (هەوا) نابینین، بەڵام هەستی پێ دەکەین، چاوەکانمان ناتوانن لە دونیادا (خودا) ببینن، بەڵام - بە پشتیوانیی خوا - لە بەهەشتدا چاوێکی باشترمان دەبێت و دەتوانین خودای ﷻ پێ ببینین[1]، بۆیە دەفەرموێت: ﴿ لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَهُوَ يُدۡرِكُ ٱلۡأَبۡصَٰرَۖ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلۡخَبِيرُ ﴾ الأنعام: ١٠٣

واتە: "دەزگای بینایی ناتوانێت ئەو زاتە ببینێت، زانیاریی ئەو خوایە هەموو شتێکی گرتووەتەوە، ئاگاداریشە بە هەموو دەزگاکانی بینایی، هەر ئەوە وردبین و ئاگایە".

---

[1] سەیری (الأسئلة العقائدية عند الأطفال والإجابة عليها، د.بسام العموش) بکە، (لا ٣٧)، هەروەها سەیری (كيف تقولها لأطفالك بول كولمان) بکە، (لا ١٥٦) و سەیری (من اليوم لن تهرب من أسئلة طفلك المحرجة، عبدالله عبدالمعطي) بکە، (لا ١٠٨).

## خودای گەورە چۆن هەموو خەڵك دەبینێت، لە کاتێکدا ژمارەی خەڵك گەڵێك زۆرە؟

بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی کرداری وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە، دەستی منداڵەکە دەگرین و دەیبەینە سەر شەقامێك، پێی دەڵێین: "یەڵلا سەیری خەڵك بکە، ژمارەی ئەو کەسانەم پێ بڵێ، کە بینیتن، ئێمەش لەگەڵت دەژمێرین"، پاشان لەگەڵ منداڵەکە دەچینە نهۆمی سەرەوە، وای لێ دەکەین ئەو خەڵکانەی دەیانبینێت بیانژمێرێت، پاشان دەیبەینە نهۆمی سەرووتر هەمان کار بکات، دواتر چاویلکەیەکی بۆ دەهێنین بۆ ئەوەی خەڵکەکە بە شێوەیەکی باشتر ببینێت" لەمیانەی ئەم نموونانەوە فێری دەکەین، کە ئێمە ناتوانین کاروبارەکان بە پێوانەی خۆمان پێوانە بکەین، پێوانەی مرۆڤ سنووردارە. بۆی ڕوون دەکەینەوە، کە توانای خودای موتەعال گەورەترە و زیاترە لە توانای هەموو دروستکراوان، بەردەوام لە مێشکی دەچەسپێنین: ﴿أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ البقرة: ١٠٦، کە پەروەردگار دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

دەتوانین پرسیارێکی هەستپێکراوی لێ بکەین، پێی بڵێین: "ئایا پێتوایە مێروولە ئێمە دەبینێت بە هەموو وردەکارییەکانمانەوە؟ یان تەنیا خەیاڵ، یان سێبەرێك دەبینێت؟" لە وەڵامدا دەڵێت: "مێروولە ناتوانێت ببینێت، مەگەر شتێکی زۆر بچووکی هێندەی پەنجەی پێ نەبێت، پەنجە لە لای ئەو وەك شاخێك وایە". باشە.. ئایا ئەگەر مێرولە پرسیارێکت لێ بکات و بڵێت: " تۆ چۆن ئێمە هەمووومان لە یەك کاتدا دەبینیت؟"

ئەوکات وەڵامەکەت ئاسایی دەبێت بەوەی ئەم کارە لەگەڵ تواناکانتدا گونجاوە، کە خوای گەورە پێی بەخشیویت. مێروولە تواناکانی سنووردارە، لەوانەیە لە ژوورێکدا زیاتر لە ماڵێکی مێروولەکان هەبێت، زۆر ئاسانە بتوانیت لە یەك کاتدا هەموویان ببینیت، بەڵام توانای بینینی مێروولە سنووردارە و ناتوانێت وەك تۆ ببینێت. هەروەك ئەوەی پێشووتر ئێمە رێککەوتین لەسەر ئەوەی، کە هیچ شتێك نییە لە وێنەی خوای گەورە و هیچ شتێکیش لەو ناچێت و توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، بۆیە گونجاو نییە ئێمە بەو توانا کەمە سنووردارەی هەمانە پرسیار لە خوای گەورە بکەین، ئەم کارە بۆ خوای گەورە ئاساییە" توانای ئەو زاتە زۆر و گەورەترە لە هەموو دروستکراوەکانی، چونکە: ﴿أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ البقرة: ۱۰٦، خوای پەروەردگار دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

## ئایا خودای گەورە مرۆڤەکان لە تاریکیدا دەبینێت؟

دەکرێت دیمەنێك لەو فیلمانە نیشانی منداڵ بدەین، کە تیایدا سەربازەکان بە چاویلکەی شەوبینین، سەیر دەکەن" هەروەها دیمەنی هەندێك ئاژەڵ و باڵندەی نیشان بدەین، کە توانای بینینیان هەیە لە شەودا، یاخود هەندێ تیشك هەن - وەك لیزەر - دیوی پشتەوەی شتەکانمان نیشان دەدات، دەتوانین بە هۆیانەوە شتەکان لە تاریکیدا ببینین، دوای هەموو ئەمانە پێی دەڵێین: "ئێستا بینیت کە چۆن مرۆڤی بێدەسەڵات و سادە، هەندێ جار دەتوانێت لە تاریکیدا شت ببینێت؟ ئەی چی لەبارەی خوای گەورەمان، کە مرۆڤ و هەموو بوونەوەری

دروستکردووە؟[1] ئەمە ئەگەر خوای گەورە ئەو دەسەڵاتەی پێ بەخشیبین بۆ ئەوەی ئەم جۆرە ئامێرانە دروست بکەین، ئایا خودی خۆی - کە دەسەڵاتدار و باڵادەستە - ناتوانێت ئەم کارە بکات؟! ئەو خاوەن هێز و توانای ڕەهایە، هیچ شتێك نییە بتوانێت ڕێ لە هێز و توانای خوای گەورە بگرێت.

## چۆن خودای گەورە لە ماڵەکانماندا دەمانبینێت، لە کاتێکدا دەرگا و پەنجەرەکانیش داخراون؟

وێنەی تیشکی پزیشکی (أشعه) نیشانی منداڵ دەدەین، مرۆڤ، کە دروستکراوی خوایە، دەتوانێت ئێسك ببینێت لە کاتێکدا داپۆشراوە" ئەویش لە ڕێگەی تیشکی (سینی)، ئەی چی لەبارەی خوای پەروەردگارەوە؟ بەدڵنیاییەوە ئەو زاتە دەمانبینێت، کە لە ماڵەکانمانین هەموو دەرگا و پەنجەرەکانیش داخرابن. هیچ شتێك نییە لە وێنەی خوای گەورە، ئەو زاتە وەك مرۆڤ نییە، کە دیوارەکان و بەربەستەکان ڕێگربن لە بەردەم بینینی شتەکاندا. بە هیچ شێوەك ناکرێت و ناگونجێت بەدیهێنەر وەك بەدیهێنراو بێت، چونکە خوای گەورە توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، گونجاوترە ئەم وەڵامە ببەستینەوە بە ڕەفتاری منداڵەوە، لایەنی خودچاودێری و حەزی ئایینی لە لای منداڵ بەهێزتر بکەین.[2]

---

[1] سەیری (من اليوم لن تهرب من أسئلة طفلك المحرجة، عبدالله عبدالمعطي) بکە، (لا ١٠٣).

[2] سەیری (من اليوم لن تهرب من أسئلة طفلك المحرجة، عبدالله عبدالمعطي) بکە، (لا ١٠٤). هەروەها سەیری (كيف أجيب عن أسئلة طفي؟ مروة عاشور) بکە، ماڵپەری (الألوكة) ١٤٣٢/٢/١٩

## خودای گەورە چۆن بە هەموو کردەوەکانمان دەزانێت و چاودێریی هەموو خەڵك دەکات؟

پێویستە منداڵ بەردەوام فێربکرێت، کە خوای گەورە خاوەنی هەموو سیفەتێکی تەواوە و بێکەموکورییە، پیوستە بیشزانێت توانا و دەسەڵاتی خودا بێسنوورە، ئەو بەدەسەڵات و باڵادەستە" پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿أَنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ البقرة: ١٠٦، خودای مەزن دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، هیچ شتێك نە لە ئاسمان و نە لە زەوی ڕێگر نییە لە بەردەم دەسەڵاتی ئەودا، بە هیچ شێوەیەك ناکرێت توانا و دەسەڵاتی ئەو زاتە لەگەڵ توانای دروستکراوەکانیدا بەراورد بکرێت، هەرچەند توانای دروستکراوەکان گەورە و فراوان بێت، خوای پەروەردگار گەورەتر و باڵادەسترە.

بۆ ڕوونکردنەوە: دەتوانین نموونەیەکی بۆ بهێنینەوە بە بە تۆمارکردنی کامێرا، کە کامێرا توانای هەیە هەرچی لە بەردەم زوومەکەیدا بێت بە گەورە و بچووکەوە تۆماری بکات، خوای پەروەردگار خاوەنی هەموو سیفاتە بەرز و بڵند و پیرۆزەکانە، لە یەك کاتدا توانای چاودێریکردنی هەموو مەخلووقاتی هەیە، چونکە تواناکانی بێسنوورن، زانست و زانینی خودای موتەعال گشتگیرە و هەموو شتێکی گرتووەتەوە.[١]

دەتوانین نموونەی تری بۆ بهێنینەوە، بۆ نموونە: با وا دابنێین کۆمپانیایەکی زەبەلاح هەیە و دەیەوێت چاودێریی هەموو کارمەندەکانی بکات، بێ ئەوەی کارمەندەکان بزانن کامێرای چاودێرییان بۆ دادەنێت، ئەوانیش ئاگایان لە هیچ نییە" لە یەك کاتدا و لە چوارچێوەی

[١] سەیری (الأسئلة العقائدية عند الأطفال والإجابة عليها، د. بسام العموش) بکە، (لا ٤٢).

شاشەیەكەوە چاودێریی كار و كردەوەی هەموو كارمەندان دەكات. جا ئەمە، ئەگەر كاری بەندەیەكی بێهێز و سادە بێت، كە دروستكراوی خوای گەورەیە، ئایا خوای دروستكاری بەندەكان توانای نییە هەموو بەندەكان لە یەك كاتدا ببینێت؟

## بۆچی مرۆڤ دەمرێت و خودا نامرێت؟

مردن ئەندازە و پێوانەیەكی خوای گەورەیە، كە بۆ دروستكراوەكانی خۆی داناوە. پەروەردگار دەفەرموێت ﴿ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ۖ ثُمَّ إِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ﴾ العنكبوت: ٥٧

واتە: "هەموو كەس دەبێت مردن بچێژێت، لەوەودوا تەنیا بۆ لای ئەو دەبرێنەوە"، مردنی مرۆڤ سەرەتای هاتنی ژیانی دوارۆژە، كە ئەو ژیانە گرنگترە.

مردن نیشانەی كەموكوڕییە لە ژیانی دروستكراوەكاندا، كەموكوڕییش لەگەڵ خوای گەورەدا بوونی نییە، خوای گەورە نە دروستكراوە و نە دەیشمرێت، بەڵام مرۆڤ دروستكراوە و دەیشمرێت. ژیانی خوای گەورە وەك ژیانی ئێمە نییە، ژیانی ئێمە بە مردن كۆتایی دێت، هەرچی دروستكراویشە دەبێت بمرێت، هیچ كەسێك نامێنێت جگە لە خوای پەروەردگار، ژیانی خوای گەورە هەموو سیفەتێكی كەماڵ و بێكەموكوڕیی لەخۆگرتووە، لە هەموویشیان گرنگتر بەردەوام زیندووە و هەرگیز نامرێت.[1]

---

[1] سەیری (الأسئلة العقائدية عند الأطفال والإجابة عليها، د. بسام العموش) بكە، (لا ٥٤)، سەیری (الله حي لا يموت، محمد راتب النابلسي) بكە لە ماڵپەڕی (موسوعة النابلسي للعلوم الإسلامية).

## خودای گەورە منی خۆش دەوێت، وەك چۆن من ئەوم خۆش دەوێت؟

خوای پەروەردگار زۆر لێخۆشبوو و بەبەزەیی و دلۆڤانە، مرۆڤە پاکە ڕاستگۆکانی خۆش دەوێت، دەفەرموێت: ﴿ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥ ﴾ المائدة: ٥٤

واتە: "پەروەردگاری مەزن خۆشی دەوێن و ئەوانیش ئەویان خۆش دەوێت"، ڕێزیان لێ دەگرێت و چاودێرییان دەکات و کاروبارەکانیان هەڵدەسووڕێنێت و ڕۆزییان دەدات و لێیان خۆش دەبێت. هەریەکێك لە ئێمە هەست بە سۆز و میهرەبانی و ڕێزگرتنی پەروەردگار بۆ خۆی دەکات، خوای پەروەردگار ئەو بەندەیەی خۆش دەوێت، کە ملکەچی فەرمانەکانییەتی و هەموو کارێکی پێویست دەکات بۆ بەدەستهێنانی خۆشەویستیی ئەو زاتە" لەو کارانەیش: پارێزگاریکردن لە نوێژەکان و چاکەکردن لەگەڵ دایك و باك، چاکە و بەخشین بەرامبەر خەڵکی، ڕاستگۆیی و قورئانخوێندن، پارێزگاریکردن لە زیکرەکان و چەندان کاری چاکەی تر... هەرکەسێك ئەم کارانە بکات، خودای مەزن خۆشی دەوێت.[1]

* * *

[1] سەیری (الأسئلة العقائدية عند الأطفال والإجابة عليها، د. بسام العموش) بکە، (لا ٥٨)، سەیری (أتمنى أن يحبني ربي، أميمة الجابر) بکە لە ماڵپەری (موقع المسلم)، مێژووی بڵاوکردنەوە ١٤٣٣/٣/١٩ هـ.

## پرسیارە پەیوەندیدارەکان بە فریشتەکانەوە...

### فریشتەکان کێن؟

ئەوان دروستکراوێکن خوای گەورە لە ڕووناکی (نوور) دروستی کردوون، پێش دروستکردنی مرۆڤ ئەوانی دروستکردووە، خاوەن ئیرادە و عەقڵن و باڵیان هەیە، شێوەیان زۆر جوانە" توانایان هەیە لەسەر شکڵی مرۆڤ خۆیان نیشان بدەن، نە خواردن دەخۆن نە خواردنەوە، بەندەگەلێکی خوای گەورەن و هەر فەرمانێکیان لە لایەن ئەو زاتەوە پێ بکرێت جێبەجێی دەکەن. ئەوانیش پلەوپایەیان زۆرە، لە هەموویان بەڕێزتر و بەرزتر (جوبریلە) عليه السلام، ئەرکی گەیاندی پەیامی خوای گەورەی پێ سپێردراوە بۆ پێغەمبەران - سڵاوی خوایان لەسەر بێت -، هەروەها میکائیل و ئیسرافیل و چەندانی تر هەن، لەوانە: فریشتە چاودێرەکان، ئەمانە ئەرکیان پاراستنی بەندەکانە لە هەموو کاتێك. ژمارەی فریشتەکان ئێجگار زۆرە، بەڵام هەریەکەیان خاوەن ئەرکێکی تایبەتە و پێویستە لەسەری جێبەجێی بکات.(١)

(١) سەیری (عالم الملائكة الأبرار، عمر الأشقر) بکە، (لاپەڕەکانی: ٩، ١٢، ١٥، ١٦).

## فریشتەکان ناویان چییە؟

فریشتەکان ژمارەیان زۆرە، تەنیا خوای گەورە ﷻ دەزانێت ژمارەیان چەندە، ناوەکانیان ئەمانەن: جبریل، میکائیل، ئیسرافیل، ڕەزوان و مالیك - ڕەزای خوا لەسەر هەموویان بێت -" هەروەها هەڵگرانی عەرشی پەروەردگار، چاودێران و تۆمارکاران و پارێزەران، کە کار و کردەوەکان تۆمار دەکەن و دەیانپارێزن، هەروەها گەلێك فریشتەی زۆری تر.[1]

## بۆچی خوای گەورە فریشتەکانی دروستکردووە؟

خوای گەورە لەپێناو چاکە و خێردا دروستی کردوون، بۆ خۆیان سەراپا چاکە و خێرن و هەرگیز کاری خراپە ئەنجام نادەن و خراپەیش نازانن. ئەوان لەبنەڕەتدا لە ئاسمانن، بەڵام کاتێ مرۆڤ هاتە سەر زەوی، پێویستی کرد فریشتەکانیش دابەزنە سەر زەوی" ئەویش لەپێناو راپەڕاندنی ئەرکی دیارکراوی خۆیان، کە خوای گەورە پێی سپاردوون، لەوانە: پاراستن و چاودێری و گرنگیپێدان و ڕاگەیاندن و سەرخستن و داواکردنی لێخۆشبوون و ئامادەبوونیان لە کۆڕ و دانیشتنەکانی یادکردنەوەی خودا و چەندان کاری تر... دەکرێت بە منداڵ بوترێت، کە فریشتەکان دوو ئەرکی سەرەکییان هەن، ئەوانیش: پەرستنی خوای پەروەردگار و ڕاپەڕاندن و جێبەجێکردنی کاروباری گەردوون.[2]

---

[1] سەیری (عالم الملائكة الأبرار، عمر الأشقر) بکە، (لا ١٦).

[2] سەیری (الأسئلة العقائدية عند الأطفال والإجابة عليها، د.بسام العموش) بکە، (لا ٩٠). هەروەها سەیری (عالم الملائكة الأبرار، الأشقر) بکە، (لا ٣٥، ٥٢، ٧٧). سەیری

## بۆچی فریشتەکان نابینین؟

مرۆڤ توانای بینینی فریشتەکانی نییە لەسەر ئەو شکڵ و شـێوەیەی، کە خوای گەورە دروستی کردوون، بۆیە هەندێ جار دەچـنە سـەر شـێوەی مرۆڤ بۆ ئەوەی بنیادەم بتوانێت بیانبینێت و مامەڵـەیان لەگـەڵ بکـات، وەك چۆن ئەمە ڕوویـدا کـاتێ جوبریـل ﷺ لـە فـەرموودەی فێربـوونی کاروبارەکانی دیندا خۆی خستە سەر شێوەی عەرەبێکی دەشتەکی.[1]

## جنۆکەکان (پەرییەکان) کێن؟

ئەوان دروستکراوێکن لە دروستکراوەکانی خوای پەروەردگار، لە ئاگر دروسـتی کـردوون، ئەرکـدار کـراون بـە ئەنجامـدانی کـارە باشـەکان و ڕێگریکردن لە قەدەغەکراوەکان. ئەوانیش وەك سەرجەم دروسـتکراوەکانی تر دەمرن، ئێمە ناتوانین بیانبینین و ئەو توانایەمان نییـە. خـوای گـەورە هەندێ توانای پێداون جیاواتر لە تواناکانی مرۆڤ، لەوانە: توانـای فـڕین و بەخێرایی ڕۆیشتنیان و خۆ مایشکردن لەسەر شکڵ و شێوەی جیـاواز.[2] جنۆکەکان جیاوازن لـە مـرۆڤ، چـونکە ئـەوان لـە ئـاگر دروسـتکراون و مرۆڤیش لە قوڕ.

---

(محاضرات في الإيمان بالملائكة، أ.د محمد الجهني) بکە، (لا ٥٣).

[1] سەیری (حقیقة الملائكة، أحمد النجار) بکە، (لا ٥٤).

[2] سەیری (عالم الجن والشیاطین، عمر الأشقر) بکە، (لاپەڕەکانی ١١، ١٢، ٢٢).

## کێ بەهێزترە، فریشتەکان، یان جنۆکەکان (پەرییەکان)؟

ژیانی فریشتەکان بەردەوامە و هەرگیز نامرن، تا ڕۆژی دوایی، بەڵام جنۆکەکان پێش ئەو ڕۆژە دەمرن، بۆیە مادام بەم شێوەیەن، فریشتەی گیانکێشان، کە بە فەرمانی خودا ئەم کارە دەکات، گیانی ئەوانیش دەکێشێت[1]: ﴿ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا ﴾الزمر: ٤٢

واتە: "هەر خوایە، کە گیانەکان دەکێشێت لە کاتی مردنیاندا"، بۆیە لەم ڕووەوە فریشتەکان بەهێزترن لە جنۆکەکان، تەنانەت لە ژیانی دونیایشدا شەیتانەکان (کە جنۆکەن) لە فریشتەکان دەترسن، وەك ئەوەی لە جەنگی بەدر ڕوویدا، کاتێك شەیتانەکان بینییان خوای گەورە فریشتەکانی بۆ سەرخستنی باوەڕداران دابەزاندووە، ئەوکات شەیتانەکان بێباوەڕەکانیان وت: ﴿إِنِّي بَرِيٓءٌ مِّنكُمْ إِنِّيٓ أَرَىٰ مَا لَا تَرَوْنَ إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ ۚ وَٱللَّهُ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴾ الأنفال: ٤٨

واتە: "بەڕاستی من بەریم لە ئێوە، چونکە بەڕاستی ئەوەی من دەیبینم ئێوە نایبینن، بێگومان من لە خوا دەترسم، خوایش زۆر سەخت و بەزەبرە لە تۆڵەدا".

## ئایا فریشتەکان دەمرن؟

بەڵی فریشتەکان دروستکراوێکن لە دروستکراوەکانی پەروەردگار،

---

[1] سەیری (الأسئلة العقائدية عند الأطفال والإجابة عليها، د. بسام العموش) بکە، (لا ٩٨).

هەرچی شت هەیە لەناوچووە و تیادەچێت و دەمرێت، جگە لە خوای تاك و تەنیا ﷻ، ئەو زاتێکی هەمیشە زیندوو و نەمرە[1]، پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿كُلُّ شَيۡءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجۡهَهُۥۚ﴾ القصص: ٨٨

واتە: "هەرچی شت هەیە تیاچوو و لەناوچووە، جگە لەو زاتە"، سەرجەمی خەڵکی سەر زەوی دەمرن، بە هەمان شێوە خەڵکی ئاسمانەکانیش دەمرن، تەنیا ئەوەی خوا فەرمانی لەسەر بێت. جگە لە خوای پەروەردگار هیچ کەسێکی دیکە نامێنێت، ئەو زاتە هەمیشە زیندووە و هەرگیز نامرێت.

* * *

[1] سەیری (عالم الملائكة الأبرار، عمر الأشقر) بکە، (لا ١٨)، سەیری (حقيقة الملائكة أحمد النجار، د. بسام العموش) بکە، (لا ٦٦).

## پرسیاره پەیوەندیدارەکان بە کتێب (پەرتووک)ـە ئاسمانییەکانەوە...

### کتێبە ئاسمانییەکان چین؟

ئەوانە کۆمەڵە کتێبێك (پەرتووك)گەلێکن، کە خوای پەروەردگار بـۆ پێغەمبـەرانی دابەزانـدوون، بـۆ ئـەوەی پەیامەکـەی بگەیـەنن و شەریعەتەکەی جێبەجێ بکەن. ئەم کتێبانە ڕێنوێنی و سۆز و میهرەبـانین بۆ خەڵك، بۆ ئەوەی بەختەوەریی دونیـا و دوارۆژ بەدەسـت بهێـنن. لـەو پەرتووکانەی بە ئێمە گەیشتوون ئەمانەن: خوای گـەورە (الصـحف)ی بـۆ ئیبراهیم ﷺ دابەزاندووە، هەروەها زەبوور بۆ داود ﷺ و تـەورات بـۆ موسا ﷺ و ئینجیل بۆ عیسـا ﷺ و قورئانیشـی بـۆ پێغەمبـەرمان محمد ﷺ دابەزاندووە.[1]

---

[1] سەیری (الإیمان بالكتب، د. محمد الحمد) بکە، (لا ٤، ٥).

## بۆ پێویستمان بە قورئانە؟ بۆچی قورئان موعجیزەیەکی نەبڕاوەیە؟

ئەگەر ئامێرێکی سادەی دروستکراوی دەستی مرۆڤ پێویستی بە کەتەلۆك بێت، تا فێرمان بکات چۆن کار دەکات و چۆن بە باشترین شێوە بەکاری بهێنین، خودی مرۆڤ - کەدروستکراوی پەروەردگارە - لە هەموو شتێك لە پێشترە بۆ ئەوەی پێویستی بە کتێبی ڕێنوێنی و فێرکردنی ڕێگەکانی سەرکەوتن و سەرفرازی و چاکسازی هەبێت لە دونیا و دوارۆژ، خوای گەورە دەفەرمویێت: ﴿ أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ ﴾ الملك: ١٤.

واتە "مەگەر خوا نازانێت کێی دروستکردووە و چۆنی دروستکردووە، لە کاتێکدا ئەو زاتە وردکار و بەسۆز و ئاگایە؟"

قورئان موعجیزەیە، لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ، کە خاتەمی پێغەمبەرانە پێویستە موعجیزەکەی نەبڕاوە و نەمر بێت، چونکە هیچ پێغەمبەرێك دوای ئەو نییە و نایەت، بۆیە دەبێت پەیامەکەی، تا ڕۆژیی دوایی بمێنێت و خەڵك هیچ بیانوویەکیان نەمێنێت. بەڵگەکانی موعیجزەی قورئان ئێجگار زۆرن، لە هەموویان گرنگتر موعجیزە زمانەوانی و ڕەوانبێژییەکەیەتی، ڕووبەڕووی عەرەبەکان وەستا و بێمنەتی کردن لەوەی نموونەی هاوشێوەی قورئان بهێنن، لە کاتێکدا ئەوان سەرمەشقی ڕەوانبێژی و زمانپاراوی بوون. هەرچی مرۆڤ و جنۆکە هەن دەستەوەستانن بەرامبەر هێنانی قورئانێکی هاوشێوە، ئەمەیش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی سەرچاوەی قورئان خوای پەروەردگارە.[1]

---

[1] سەیری (الإسلام ومكتشفات العلم الحديث، محمد السيد محمد) بكە، (لا ٤). هەروەها

## بۆچی خوای گەورە بەڵێنی پاراستنی كتێبەكانی پێشووی نەداوە؟

خوای پەروەردگار ﷻ هەرشتێك ویستی لەسەر بێت دەیكات، فەرمانەكانی پەروەردگار حیكمەتێكی زۆریان تێدایە، لە هەندێكیان تێدەگەین و لە هەندێكیشیان تێناگەین، بەڵام ئەو نیشانە ڕوونانەی هەن ئاماژەن بۆ ئەوەی، كە كتێبەكانی پێشوو موعجیزە نەبوون" بۆیە بەردەوامبوونیان پێویست نەبووە، هەروەك چۆن حوكمە شەرعییەكانیشیان بە شێوەی كاتی بوون و بۆ هەندێ خەڵكی دیاریكراو.[1]

---

سەیری (الأسئلة العقائدية عند الأطفال والإجابة عليها، د. بسام العموش) بكە، (لا ١٠٥) و سەیری (الإعجاز البيان يللقرآ، الكريم أركانه ومظاهره، د. حسن الترتور) بكە، گۆڤاری (البحوث الإسالامية)، (ژمارە ٣٢) و (لا ٢٢٥)، سەیری (إعجاز القرآن البياني ودلائل مصدره الرباني، د. صلاح الخالدي) بكە، (لا ٥).

[1] سەیری (الأسئلة العقائدية عند الأطفال والإجابة عليها، د. بسام العموش) بكە، (لا ١٠٥)

## بەڵگە چییە لەسەر ئەوەی قورئانی پیرۆز هیچ گۆڕانکاریی تێدا نەکراوە؟

منداڵی بچووك لە نموونەی ئەم پرسیارانە ناکات، مەگەر منداڵی قۆناغی ناوەندی و قۆناغی دواتر، بۆیە پێویست دەکات ئەم بابەتەی بە هێمنی و بەسەرخۆیی لە ڕوانگەی عەقڵییەوە بۆ باس بکرێت، کە ڕاستی و دروستیی قورئان دەسەلمێنێت" پێی دەڵێین: "هەر شتێکت دووبارە بووەوە دەچەسپێت، گەر بڵاوبووەوە دڵنیادەبێتەوە، قورئان وەك ئەوەی دەستاودەست بە (التواتر) بۆمان گواستراوەتەوە - واتە کۆمەڵێك لە کۆمەڵێکی تریان گواستووەتەوە، کە هەرگیز درۆیان لێ نەبیستراوە -، هەرچی خەڵکی تایبەت و عەوامە ئەمە دەزانن. موسڵمانان پشت لە دوای پشت بۆیان بەجێماوە، لە کۆڕ و دانیشتن و نوێژەکانیاندا دەیخوێنن، منداڵەکانیان فێردەکەن، تەنانەت ئەگەر مامۆستایەکی بەتەمەنی ڕێزدار وشەیەك هەڵە بکات" منداڵ و بچووکەکان بەر لە گەورەکان بۆی ڕاست دەکەنەوە، تا بەم شێوەیە بەپاکی و دوور لە زیادی و کەمی گەیشتووە بە ئێمە. پارێزراوە لە هەموو دەستکارییەك، هەرکەسێکیش نکوولی لەمە بکات، ئەوکات نکوولی لە بوونی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵە بەڕێزەکان و کەسانی بەناوبانگی مێژوویش دەکات، خۆ کەسی تێگەیشتوو ئەم کارە ناکات" هەروەك چۆن قورئان ڕووبەڕووی مرۆڤ و جنۆکەکان وەستایەوە بەوەی، ئەگەر بتوانن قورئانێکی هاوشێوە بهێنن، بەڵام نەیانتوانی. قورئان بە هەموو پێکهاتەکەیەوە هیچ جۆرە ناکۆکی و کەموکورییەکی

تێــدا نییــە، پــڕە لــە مــوعجیزەی هەواڵپێــدانی نەتــەوەکانی پێشــوو و حوکمەکانی شەرع و... هتد. هەموو ئەمانە بەڵگەن لەسەر ئــەوەی، کــە قورئان لە لایەن مرۆڤەوە نەهاتووە، چونکە کار و وتاری مــرۆڤ بــەردەوام کەموکوڕی و گۆڕانکاریی تێدایە، بۆیە لە لایەن خوای گەورەوە هــاتووە و هەر خۆیشی بەڵێنی پاراستنیی داوە.[1]

* * *

[1] سەیری (الأدلة العقلية والتاريخية على صحة وحفظ القرآن الكيم،) بکە لە (مركز الفتوى) ماڵپەری (اسلام ويب)، مێژووی بڵاوکردنەوە ٢٠٠١/٥/٢١م، هەروها سەیری (الأدلــة علــى أن القرآن كلام الله، محمد المنجد،) بکە ماڵپەری (الإسلام سؤال وجواب)، ٢٠٠١/١١/٥م.

## پرسیارە پەیوەندیدارەکان بە پێغەمبەرانەوە...

### پێغەمبەران کێن؟

ئەوان مرۆڤن و لە نەوەی ئادەمن، خوای گەورە وەحیی پێغەمبەرایەتیی بۆ ناردوون و فەرمانی گەیاندنی پەیامەکەی بۆ نەتەوەکەی خۆیانی پێداون، کە بانگیان بکەن بۆ پەرستنی خوای تاك و تەنیا. یەکەمی هەموو پێغەمبەران (ئادەم)ە ﷺ و کۆتا پێغەمبەریش (محمد)ە ﷺ. پێغەمبەران ژمارەیان زۆرە، چونکە خوای گەورە بۆ هەموو نەتەوەیەك، کە لەسەر زەوی ژیابن، پێغەمبەری لە خۆیان بۆ ناردوون، لە هەر قۆناغێك لە قۆناغەکانی مێژوودا پێغەمبەرێك هەبووە بانگەوازی نەتەوەکەی کردووە بۆ ڕێی هیدایەت و ڕێگەی دروست.

### بۆچی خوای گەورە، پێغەمبەرانی ڕەوانە کردوون؟

خوای گەورە لەبەر سۆز و میهرەبانیی خۆی بۆ خەڵکی و ڕێنوێنیکردنیان و گەیاندنی پەیامەکەی، پێغەمبەرانی ڕەوانە کردووە. پێغەمبەر، کەسێکە خەڵکەکەی دەیناسن و شایەتیی باشیی بۆ دەدەن پێش دابەزینی سروش (وەحی) بۆی، خوای پەروەردگاریش کردوویەتی بە پێشەنگێکی بینراو بۆ خەڵك، ڕەوشت و ڕەفتاری باشیان فێر دەکات و هەرشتێك سوود و قازانجی بۆ خەڵك هەبێت بۆیان شی دەکاتەوە و شتی زیانبەخشیان لێ بەدوور دەگرێت. خوای مەزن بە ناردنی پێغەمبەران

بیانووی خەڵکی بڕی، بەوەی بڵێن کەس نەبووە ڕێنوێنیمان بکات.

پێغەمبەران هەموویان لەسەر یەك ئایینن ئەویش پەرستنی خوای تاك و تەنیایە (یەکخواپەرستی)[1]، مرۆڤەکانیش پێویستیان بە ڕێنوێنی و هیدایەتە بۆ ڕێگەی ڕاست، کە بە زمانی خۆیان بێت و لێی تێبگەن، بۆیە خوای گەورە کتێبەکانی بە زمانی نەتەوەکەیان بۆ پێغەمبەران ناردووە" ئەمەیش بۆ ئەوەی پەیامی پەروەردگاریان بە ڕوونی و ئاشکرایی پێ بگات.

## ئایا پێغەمبەران دوورن لە هەڵە و تاوان؟

پێغەمبەران بەشێکن لە مرۆڤ، واتا هەمان تایبەتمەندیی مرۆڤیان تێدایە، ئەوەی پەیوەندیدارە بە پەیام، خوای پەروەردگار دووری خستوونەتەوە لە هەرچی گوناه و هەڵە و تاوانە" هەروەها پاراستوونی لە هەرشتێ، کە ڕەوشت و ڕەفتاریان بڕووشێنێت، بۆ ئەوەی نەکا زیان بە پەیامەکەی پەروەردگار بگات، ئەمەیش لەپێناو ئەوەی ببنە پێشەنگێکی نموونەیی و خەڵك دەست بە گوفتار و کردەوەکانیانەوە بگرێت" بەڵام - لەگەڵ ئەوەیشدا - مرۆڤن ئەو هەڵە بچووك و ئاساییەیان لێ ڕوودەدات، کە زیان بە پەیامی پەروەردگار ناگەیەنێت، وەك: هەڵەی دیاریکردنی شوێنێکی گونجاو بۆ کشتوکاڵکردن، یان بۆ جەنگ، یاخود لە ڕوانگەی مەزەندەکردنی خەمخواردنی بۆ بانگەوازەکەی، وەك ئەو هەڵوێستەی

[1] سەیری (الأسئلة العقائدية عند الأطفال والإجابة عليها، د.بسام العموش) بکە، (لا ١٢٣)، سەیری (حکمة إرسال الرسل، محمد العثيمن) بکە ماڵپەری (طريق الإسلام).

پێغەمبەری خوا ﷺ، کە لەگەڵ (عبداللە)ی کوڕی (ام مکتوم) هەیبوو.[1]

## محمد ﷺ کێیە؟

خاتەمی پێغەمبەرانە، کە خوای گەورە بۆ ڕێنمایی بەندەکانیی ڕەوانە کردووە، ناوی (محمد)ی کوڕی (عبداللە)ی کوڕی (عبدالمطلب)ی کوڕی (هاشم)ی قورەیشییە. لە ڕۆژی دووشەممە لە مانگی (ربیع الثاني) لە ساڵی (فیل) لە مەککە لەدایك بووە، لە سکی دایکیدا بووە کاتێ باوکی وەفاتی کردووە، لە تەمەنی شەش ساڵیشدا دایکی وەفاتی کردووە، باپیری ئەرکی چاودێریکردنی لە ئەستۆگرت، ئەویش وەفاتی کرد کاتێك تەمەنی پێغەمبەر ﷺ هەشت ساڵان بوو" لە دوای ئەو عەبدولموتەلیبی مامی چاودێریی کردووە. بەهۆی ڕەوشتبەرزییەوە بە ڕاستگۆی دەستپاك ناسرابوو، لە تەمەنی چل ساڵیدا بوو بە پێغەمبەر، بۆ ماوەی سیانزە ساڵ بانگەوازی خەڵکی مەککەی کرد بۆ ئیسلام. کاتێك ئازاری زۆریان دا، کۆچی کرد بۆ مەدینە و دە ساڵ لەوێ جێگیر بوو، برایەتیی لە نێوان کۆچەری (مهاجر) و پشتیوانان (أنصاری)دا دروست کرد، یاسا و شەرعی خوای دامەزراند، دوای ئەوەی پەیامی خوای گەورەی بەتەواوی گەیاند و ئەمانەتی سەرشانی بەجێگەیاند" لە ساڵی ١١ کۆچیدا وەفاتی کرد ە گەڕایەوە بۆ لای پەروەردگاری.[2]

---

[1] سەیری (الأسئلة العقائدية عند الأطفال والإجابة عليها، د. بسام العموش) بکە، (لا ١٣١)، سەیری (عصمة الأنبياء محمد الدليمي) بکە، (لا ٤)

[2] سەیری (أصول الدين الإسلامي، محمد التويجري) بکە، (لا ٧٤).

## بەڵگەی سەلمێنەری پێغەمبەرایەتی چییە؟

بەڵگـەکانی پێغەمبەرایـەتیی موحەممـەد ﷺ ئێجگـار زۆرن، لـە هەموویان گرنگتر قورئـانی پـیرۆزە، ئـەم قورئانـە پـڕ لـە ئیعجـازە بـە ئێستایشەوە هەموو خەڵکلە ی پشت دوای پشـت سەرسـام کـردووە" بـە گەنجینە پڕ مرواری و گەوهـەرەکانی، زەیـن و ئەندێشـەی مـرۆڤ تووشـی سەرسوورِمان کردووە. هەر لە بەڵگـەکانی پێغەمبەرایـەتی: ڕاسـتگۆیی، ژیاننامەکـەی و ڕەوشـتبەرزییەکەی، کـە دوژمنـەکانی بـەر لـە پێغەمبەرایەتی شایەتییان بـۆ داوە، بـە ڕاسـتگۆی دەسـتپاك ناوبـانگی دەرکردبوو. هەر لە بەڵگەکان: موعجیزە یـەك لـە دوای یەکـەکانی، کـە خەڵکی سەردەمی خۆی بە چاوی خۆیان بینویانە و پشت لە دوای پشت بۆ خەڵکی بـاس کـراون. هـەر لـە بەڵگـەکان: ئـەم شـەریعەتە مەحکـەم و توندوتۆڵە پڕ لە جوانییەیە. هەر لە بەڵگەکان: ئەو مزگێنییانـەی کتێبـە ئاسمانییەکانی پێشووتری لەبارەی ئەوەوە پڕکردبوو. هـەر لـە بەڵگـەکان: بڵاوبوونەوەی بەردەوامی ئایینی ئیسلام لە هەموو کات و شوێنێك. هـەر لـە بەڵگـەکان: هەواڵپێـدان لـەبارەی نەتـەوەکانی پێشـووتر، هـەروەها هەواڵدانپێدانی کاروبارەکانی داهاتوو.[1]

---

[1] سەیری (الدلائل النبوة منقذ السقار) بکە، (لاپەڕەکانی ٤، ٩، ١٨، ٤٨، ١٠٥، ١١٢، ١٢٨).

## چۆن پێغەمبەر ﷺ شەوڕەویی پێ کرا بۆ ئاسمان لە یەك شەودا؟

پێغەمبەر ﷺ بە ئەسپێکی باڵدار (بُـراق) شـەوڕەویی پـێ کـرا، تـا گەیشتە مزگەوتی ئەقسا، پاشان بـە هاوڕێیـەتیی جوبریـل ﷺ بـەرەو ئاسمان بەرزکرایەوە. خوای پەروەردگار توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە و هیچ شتێك نە لە ئاسمان و نە لە زەوی ڕێگر نییە لە بەردەم دەسەڵاتیدا، وەك چۆن ئەمڕۆ دەبینین مرۆڤی دەستەوەسـتان توانیویـەتی بـە مێشـکی خۆی فڕۆکە دروست بکات لە خێرایی دەنـگ خێراتـر بێـت، توانیویـەتی تایبەتمەندیی گواستنەوەی وێنەی سێ ڕەهەندی دابهێنێت، وای لێ دەکات مرۆڤ لە یەك کاتدا لە چەند شوێنێك ببینرێت، بـەڵام خـوای پـەروەردگار لەڕادەبەدەر لە دروستکراوەکانی بەتواناتر و گەورەتر و بەهێزترە.

## بۆچی محمد ﷺ خاتەمی پێغەمبەرانە؟

کاری ناردنی پێغەمبەران (سڵاوی خوایان لەسەر بێت) بە حیکمەت و دانایییەکەوە بەستراوەتەوە، کـە ڕێنـوێنی و ئامۆژگارییـە، لەبـەر ئـەوەی کتێبەکانی پێشوو دوای مردنی پێغەمبەرەکانیان تووشی دەسـتکاریکردن و زیادی و کەمی بوون، بۆیە حیکمـەت و دانـایی خـوای گـەورە ئـەوەی خواست پێغەمبەرێك بنێرێت و پەرتووکێکی لەگەڵ بێـت دوور بێـت لـەو کەموکوڕییـەوە" تەنانـەت خـوای گـەورە خـۆی ئـەرکی پاراسـتنی ئـەم

پەرتووکەی، تا ڕۆژی دوایی لە ئەستۆ گرت. بەوپێیەی موعجیزەی قورئان بەردەوام و نەبڕاوەیە، ئەوکات ژیری و داناییە، کە پێغەمبەر ﷺ خاتەمی هەموو پێغەمبەران بێت.

## بۆچی پێویستە پێغەمبەرمان ﷺ خۆش بوێت؟

چونکە خۆشویستنی پێغەمبەر ﷺ لە پایەکانی باوەڕە، بەڵکو بەو خۆشەویستییە نەبێت باوەڕبوون بە خوای گەورە تەواو نابێت. خوشەویستیی پێغەمبەر ﷺ بەستراوەتەوە بە خۆشەویستیی خوای گەورەوە، لەبەر ئەوەی خوای گەورە لەناو هەموو خەڵکی ئەوی بۆ گەیاندنی پەیامە پیرۆزەکەی هەڵبژاردووە، چونکە خوای گەورە باشترین کەسی لە ڕووی ڕەوشت و گوفتار و کردارەوە دیاری کردووە" هەروەها ئەو زاتە لە هەموو کەس زاناترە بەوەی ئەمانەتی پەیامەکەی بە کێ دەسپێرێت، لەبەر ئەوەی خوای گەورە لەناو هەموو خەڵکیدا ئەوی بۆ ئەم ئەرکە پیرۆزەی هەڵبژاردووە، بۆیە ئەرك و پێویستە لەسەرمان لە هەموو کەس زیاتر خۆشمان بوێت، چونکە هەر ئەوە خوای گەورە بە خەڵکی ناساندووە" باشترین پێغەمبەر بووە بۆ ئۆممەتەکەی، بەسۆزترین پێغەمبەر بووە بۆ خەڵکەکەی، بۆیە دوای خوای گەورە تاکە کەسە، کە چاکەی لەسەر ئێمە هەبێت.[1] بەهۆی بانگەوازی خەڵکی بۆ دینی یەکتاپەرستی تووشی ئازار و ناڕەحەتیی زۆر بووە. کاتێك بیزانیایە خەڵك باوەڕ بە

[1] سەیری (أطفالنا وحب الرسول ﷺ، د. أماني الرمادي) بکە، ماڵپەری (صيد الفوائد)، هەروەها سەیری (محبة النبي وتعظيمة ﷺ، عبدالله الخضير وعبداللطيف الحسن) بکە، (لا ٥٣، ٥٨).

بانگەوازەکەی ناکەن خەم و پەژارە دایدەگرت و دڵی تەنگ دەبوو، ئەمەیش وەك سۆز و میهرەبانییەك بەرامبەر خەڵك بۆ ئەوەی تووشی ئاگر نەبن، پەروەردگار دەفەرمویت: ﴿ فَلَعَلَّكَ بَٰخِعٌ نَّفۡسَكَ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمۡ إِن لَّمۡ يُؤۡمِنُواْ بِهَٰذَا ٱلۡحَدِيثِ أَسَفًا ﴾ الكهف: ٦

واتە: "لەوانەیە تۆ لەتاو خەم و پەژارەدا و بەهۆی سەرئەنجامی ڕەشی ئەوانەی، کە باوەڕ بەم قورئان و فەرموودەیە ناهێنن، خۆت لەناوببەیت و لە داخ و خەفەتدا بمریت".

* * *

## پرسیارە پەیوەندیدارەکان بە ڕۆژی دواییەوە...

### ڕۆژی دوایی چییە؟

ئەو ڕۆژەیە، کە خوای گەورە خەڵکی بۆ لێپرسینەوە زیندوو دەکاتەوە. ناونراوە (ڕۆژی دوایی)، چونکە هیچ ڕۆژێك دوای ئەو نییە، هەروەها ناونراوە (ڕۆژی لێپرسینەوە)، چونکە خوای گەورە لێپرسینەوە لەگەڵ بەندەکانی دەکات لەسەر ئەو کار و کردەوانەی لە دونیادا ئەنجامیانداوە" هەرکەسێك کاری چاکەی کردبێت و ملکەچی فەرمانەکانی پەروەردگار بووبێت، دەیباتە بەهەشت، هەرکەسێکیش کاری خراپەی کردبێت و سەرپێچیی فەرمانەکانی خوای کردبێت، دەیباتە دۆزەخ.

ڕۆژی دوایی، ئەو ڕۆژەیە، کە ژیان سەبارەت بە مرۆڤ کۆتایی دێت" هەروەها پێیشی دەوترێت ڕۆژی هەڵسانەوە، واتە ئەو ڕۆژەی خەڵك لە گۆڕەکانیان هەڵدەستنەوە و بەرەو ئاسمان دەکەونەڕێ لەپێناو لێپرسینەوەیان.[1]

---

[1] سەیری (الأسئلة العقائدية عند الأطفال والإجابة عليها، د. بسام العموش) بکە، (لا ٦٨)، سەیری (اليوم الآخر، محمد التويجري) بکە، (لا ٦).

## کەی ڕۆژی دوایی دێت؟ بۆچی هاتنی ئەو ڕۆژەمان لێ شاراوەیە؟

هیچ کەسێك نازانێت کەی ڕۆژی دوایی دێت، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ يَسْأَلُونَكَ عَنِ السَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَاهَا (٤٢) فِيمَ أَنتَ مِن ذِكْرَاهَا (٤٣) إِلَىٰ رَبِّكَ مُنتَهَاهَا (٤٤) إِنَّمَا أَنتَ مُنذِرُ مَن يَخْشَاهَا ﴾ النازعات: ٤٢ – ٤٥

واتە: "(ئەی پێغەمبەر!) پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی قیامەت، کە کەی و چ کاتێك بەرپا دەبێت؟ جا تۆ لە کوێ دەزانیت کەی بەرپا دەبێت؟! تۆ لە کوێ و ئەو باسە لەکوێ؟! بێگومان کۆتایی دنیا و بەرپابوونی قیامەت، هەر پەروەردگارت دەیزانێت. بێگومان ئەرکی تۆ تەنیا بێدارکردنەوەی ئەو کەسانەیە، کە لەو زاتە دەترسن". خوای پەروەدگار هاتنی ڕۆژی دوایی لێ شاردووینەتەوە، ئەمەیش بۆ ئەوەی لەپێناو ئەو ڕۆژەدا تێبکۆشین و هەموو ڕۆژێك بە کردنی چاکە و وازهێنان لە خراپە لە ئامادەباشیدابین. گەر خەڵك وادەی هاتنی ئەم ڕۆژەیان زانیبایە، هیچ کەسێك تەوبەی نەدەکرد، مەگەر بەر لە هاتنی بە ماوەیەکی کەم، ئەوکات دونیا زیاتر پڕ دەبوو لە خراپەکاری وەك لەوەی، کە هەیە.[١]

---

[١] سەیری (الأسئلة العقائدية عند الأطفال والإجابة عليها، د. بسام العموش) بکە، (لا ٦٧).

## لێپرسینەوە چییە؟

بریتییە لەو ڕۆژەی خوای گەورە کەسانی پێشینان و پاشینان کۆدەکاتەوە، وەك دەفەرمویت: ﴿ قُلْ إِنَّ ٱلْأَوَّلِينَ وَٱلْـَٔاخِرِينَ ﴿٤٩﴾ لَمَجْمُوعُونَ إِلَىٰ مِيقَـٰتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴾ الواقعة: ٤٩ - ٥٠

واتە: "(ئەی پێغەمبەر!) پێیان بڵێ: بێگومان پێشینان و پاشینان هەر هەموویان کۆدەکرێنەوە و ڕاپێچ دەکرێن بەرەو مەیدانی ڕۆژی دیاریکراو". پاشان خوای گەورە کار و کردەوەکانیان نیشان دەداتەوە و دەیانناسێنەوە، دواتر هەرکەسەو بەگوێرەی کردەوەکانی پاداشت وەردەگرێت، هەرکەسێك چاکەیەکی کردبێت دەیبینێتەوە، هەرکەسێکیش خراپەیەکی کردبێت دەیبینێتەوە" وەك پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ﴿٧﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ﴿٨﴾ ﴾ الزلزلة: ٧ - ٨

واتە: "جا ئەوەی بەقەدەر سەنگی گەردیلەیەك خێر و چاکەی ئەنجام دابێت دەیبینێتەوە.. ئەوەیشی، کە بەقەدەر سەنگی گەردیلەیەك شەڕ و خراپەی هەبێت، دەیبینێتەوە".

## مردن چییە؟

منداڵی تەمەن شەش ساڵان و کەمتر، بەزۆری ناتوانێت بەتەواوی لە مانای مردن و زیندووبوونەوە تێبگات. مردن بریتییە لە کۆتاییەکی ناچاریی هەموو مرۆڤێك بەبێ جیاوازی. بەڵام منداڵی گەورەتر لە شەش ساڵان، تا هەشت ساڵان دەکرێت لە مانای مردن و هاتنەدیی مردن

لەسەر مرۆڤ تێبگات. منداڵی هەشت، تا دە ساڵان دەکرێت بەتەواوی لـە هزری مردن و زیندووبوونەوە تێبگات. لەوانەیـە منـداڵ بـە ڕووداوێکـی مردن لە خێزانەکەیدا تێپەڕ ببێت، ئەمەیش یەکەم ڕووبەڕووبوونەوەیـەتی لەگەڵ مردندا، نازانین هەستی چی دەبێت کاتێك بابەتی مردن و گۆڕی بە گوێدا دەچرپێنرێت. بەزۆری لەم جۆرە بابەتانـە تـرس دایـدەگرێت، بۆیـە پێویستە لەسەرمان واتای مردن بۆ منداڵ شی بکەینەوە بێ ئـەوەی درۆی لەگەڵ بکەین، یان هەوڵی لەگەڵ بـدەین، کـە بـڕوا بهێنێـت بـەوەی ئـەو کەسەی دەمرێت - بۆ نموونە - گەشتی کردووە، چـونکە زۆری پێناچـێت ڕاستیی ڕووداوەکە لە کەسانی ترەوە دەزانێت.

باشتر وایە - بەر لەوەی منـداڵ ڕووداوێکـی مـردن لـە خێزانەکـەی ببینێـت - مردنـی چـۆلەکەیەکی نیشـان بـدەین، یـان درەختێـك، یـان گیانەوەرێکی مردوو، چونکە لەم کاتەدا منداڵ هەست بـە مانـای مـردن دەکات" پاشان بەسادەیی بۆی باس بکـەین، کـە ئـەو کەسـەی دەمرێـت دەچێت لە جیهانێکی تر ژیان بەسەرببات، بەدڵنیاییەوە هەریەك لە ئێمـە کاتێك گەورە دەبین دەگەین بەوانەی پێش خۆمان مـردوون، لـە بەهەشـت پێیان شاد دەبینەوە. زۆر گرنگە منـداڵ تێبگەیـەنین، کـە مـردن واتـای کۆتایی نییە، بەڵکو بریتییە لە گواستنەوەی مرۆڤی باوەڕدار بۆ ژیانێکی خۆشتر و باشتر" هەروەها گواستنەوەی مرۆڤی بێبـاوەڕ بـۆ وەرگرتنـەوەی سزاکەی. کاتێك خوای گەورە ئێمە دەمرێنێت واتای ئەوە نییە، کە چـیتر زیندوومان ناکاتەوە، بەڵکو دەمانمرێت بۆ ئەوەی بچینە نزیـك خـۆی، لـە بەهەشتگەلێکی ئێجگار خۆش، کە نـاتوانین بـە خـەیاڵیش جوانییەکـەی وێنا بکەین.[1]

---

[1] سەیری (طفلك وأسئلته الحرجة، شاهيناز عبدالفتاح) بکـە، (لا ٧٦)، سـەیری (أسـئلة

## ئەی کەواتە بۆچی منداڵان دەمرن؟

بەزۆری منداڵ کاری خراپە ناکات و هەڵە ناکات، بۆیە کاتێك دەمرن خوای گەورە بــە ســۆز و میهرەبــانیی خــۆی پێشــوازییان لــێ دەکــات و دەیانخاتــە بەهەشــتەوە. کاتێــك کەســێك دەمرێــت و ون دەبێــت، گیــان (ڕۆح)ــەکەی هەر دەمێنێت و بــۆ لای پــەروەردگار ﷻ بــەرز دەبێتــەوە، کردەوەی باش و ڕابردووی جـوانی لــە دڵــی خەڵکیــدا دەمێننــەوە، بۆیــە پێویستە مرۆڤ خۆی بۆ دیمانەی پەروەردگاری ئامادە بکــات" ئــەویش بــە ئەنجامدانی کاری خێر و چاکە و پابەندبوون بــە ڕێنماییــە شــەرعییەکانی ئیسلامەوە.[1]

## کاتێك دەمرین بۆ کوێ دەچین؟

کاتێك ئەو وادەیە کۆتایی دێت، کە خوای گــەورە لــە دونیــادا بــۆی داناوین، دەخرێینە ناو گۆڕەوە - شوێنی تایبەت بۆ مــردوان -، گــۆڕ بــۆ کەسێ، کە باوەڕی بە خودا هەیە و ملکەچــی فەرمانەکانییــەتی و کــاری چاکە ئەنجام دەدات لە ژیانیدا" دەبێتە باخێــك لــە باخــەکانی بەهەشــت، بەخۆشی لەناویدا دەمێنێتەوە، تا ڕۆژی دوایی.[2]

---

طفلك الحرجة، أبو المجد حرك) بکە، (لا ١٦٨).

[1] سەیری (أسئلة طفلك الحرجة، أبو المجد حرك) بکە، (لا ١٧٠). هەروەها ســەیری (طفلــك وأسئلته الحرجة، شاهيناز عبدالفتاح) بکە، (لا ٧٧)،

[2] سەیری (من اليوم لن تهرب مــن أســئلة طفلــك الحرجــة، عبــدالله عبــدالمعطي) بکــە، (لا ١٥٩)، هەروەها سەیری (ابني مكتشف كيف أعينه على اكتشافه، منصور الســني) بکــە،

## ئایا مردوو دەبیستێت و دەبینێت؟ چۆن لە ژێر گڵ هەناسە دەدات؟ ئایا دەخوات و دەخەوێت؟

بەڵێ مردوو گوێی لە سڵاوکردن دەبێت، کاتێك سەلامی لێ دەکەین، گەر نزای بۆ بکەین پێی دەگات، بەڵام وەکو ئێمە هەناسە نادات، چونکە پێویستی بە هەناسەدان نییە، لەبەر ئەوەی لە ژیانێکی تردایە (بەرزەخ) و جیاوازترە لە ژیانی ئێمە" بۆیە یەکەم قۆناغی ژیانی دوارۆژ بریتییە لە بەرزەخ، یاسا و ڕێسا و سروشتی تایبەت بە خۆی هەیە، هەناسەدان و خواردن و خواردنەوە و نووستن و کارکردنی تێدا نییە، بەڵکو خۆشگوزەرانییەکی نەبڕاوە، یان سزادانێکی نەبڕاوەیە، تا ڕۆژی لێپرسینەوە.[1]

## بەهەشت چییە و چیی تێدایە؟

بەهەشت ماڵی ئاشتییە، شوێنێکی ئێجگار جوانە، هەر شتێکی حەزت لێ بێت و ئومێدی بۆ بخوازیت لەوێ هەیە، ئەو شوێنەیە کەسانی چاکەکاری تێدەچن" هەشت دەرگای هەیە و پلەی زۆرە. هەر باوەڕدارێك بەگوێرەی کار و کردەوە چاکەکانی دەچێتە ناوی، ئەو کەسەی چاکەی زۆرە پلەی لە بەهەشتدا بەرزتر و گەورەتر دەبێت لە هاوڕێکەی، کە چاکەی کەمترە، بەڵام هەموان لەوێ لەوپەڕی خۆشگوزەرانی و کامەرانی و

(لا ٧). بڕوانە (کیف أجیب عن أسئلة طفلي وأحاوره، د. سلوی مرتضی)، (لا ١٠٣، ١٠٤).

[1] سەیری (الأسئلة العقائدیة عند الأطفال والإجابة علیها، د. بسام العموش) بکە، (لا ٧٩).

بەختەوەریدا دەژیین" نە ماندوو دەبین و نە نەخۆش دەکەوین و نـە خـەم و پەژارە دەخۆین. لەوێ، بە ویست و پشتیوانیی خـودای میهرەبـان ڕووی جـوانی پـەروەردگار ﷻ و پێغەمبـەرمان و سـەرجەم پێغەمبـەران و هەرکەسێ، کە خۆشمان بوێت دەبینین. هەرشتێك حـەزمان لێـی بێـت لـە خواردن و خواردنەوە و خۆشی و چێژ تێیدا بەردەست و ئامادەیە.[1]

## دۆزەخ چییە و بۆچی خودای گەورە دروستی کردووە؟

دۆزەخ، یان ئاگر شوێنی سزادانە، ئەو جێگایەیـە خـوای گـەورە بـۆ سزادانی ئەو کەسانەی داناوە، کـە کـاری خراپـەیان کـردووە و خـەڵکیان ئازارداوە و سەرپێچیی پەروەردگاریان کردووە و فەرمانەکانی ئەو زاتەیان جێبەجێ نەکردووە.

## ئەی چارەنووسی ئاژەڵان چیی لێ دێت، ئایا دەچنە بەهەشت، یان دۆزەخ؟

ئاژەڵ بەرپرسیارێتییان لەسەر نییـە، بـەڵکو دروسـتکراوێکن خـوای گەورە دروسـتی کـردوون و بـۆ مرۆڤـی ڕام هێنـاون، نـە لێپرسـینەوەیان لەسەرە و نە سزادان. لە ڕۆژی دوایـیشدا هـەموو ئـاژەڵان کۆدەکرێنـەوە، پاشان خوای گەورە تۆڵەی هەندێکیان لە هەندێکی تریـان دەسـتێنێتەوە، تۆڵەی مەڕی بێ شاخ لە مەڕی شاخدار دەستێنێتەوە. کاتێك خوای گەورە

---

[1] سەیری (أسئلة طفلك الحرجة، أبو المجد حرك) بکـە، (لا ٢٧). هـەروەها سـەیری (أسـئلة الأطفـال الحرجـة، عائشـة الحکمـي) بکـە ماڵپـەری (الّلوکـە) مێـژووی بڵاوکردنـەوە ١٣٤٣/١/١٧هـ. بڕوانە (کیف تقولها لأطفالك، بول کولمان) ، (لا ١٥٦).

لە وەرگرتنی تۆڵە لە نێـوان ئـاژەڵان تـەواو دەبێـت، پێیـان دەفـەرموێت ببنەوە بە خۆڵ، ئەوانیش دەبنەوە بە خۆڵ و لەناودەچن.[1]

[1] سەیری (الأسئلة العقائدية عند الأطفال والإجابة عليها، د. بسام العمشو) بکە، (لا ٨١)، سەیری (مصير الحيوانات يوم القيامة، محمد المنجد) بکە، ماڵپەری (الإسلام سؤال وجواب) ٢٠٠١/٥/٣١

## پرسیارە پەیوەندیدارەکان بە قەدەر (چارەنووس)ـەوە...

### مانای قەزا و قەدەر (چارەنووس) چییە؟

قەزا و قەدەر (یان چارەنووس) یەکێکە لە پایەکانی باوەڕ، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا ﴾ الفرقان: ٢

واتە: "هەموو شتێکی دروستکردووە بە ئەندازە و قەبارە و شێوە و تام و بۆن و ڕەنگ و جیاوازیی هەمەجۆر و... هتد، نەخشەی ڕێکوپێکی بۆ هەموو شتێك داناوە".

واتای قەزا و قەدەر (چارەنووس): بریتییە لە زانستی خوای پەروەردگار بە پێوانە و ئەندازەی هەموو شتەکان، بەر لە هێنانەدییان و نووسینیان و ویستی خۆی لەسەریان و دروستکردنیان.[1].

### چۆن خودای گەورە ڕووداوەکان پێش ڕوودانیان دەزانێت؟

دەکرێت لە ڕێی هێنانەوەی نموونەیەکی هەستپێکراوەوە بۆی باس بکرێت، بۆ نموونە: ئەو کەسەی یاریچەیەکی دروستکردووە و یاریی پێ دەکات، دەزانێت بەر لەوەی یاریی پێ بکات چی بەسەر یاریچەکەدا دێت، چونکە خۆی دروستی کردووە و هەموو وردەکارییەکانی یارییەکە دەزانێت، زانیاریی تەواو و گشتگیری بە هەموو لایەنەکانی ئەم یارییە

---

[1] سەیری (الإيمان بالقضاء والقدر، د.محمد الحمد) بکە، (لا ٣٦).

هەیە، کە دەتوانێت بە ئارەزووی خۆی بیجووڵێنێت" خوای گەورەیش ئەو زاتەیە، کە ئەم مرۆڤەی دروستکردووە، خاوەن گەورەترین دەسەڵات و فراوانترین زانست و تەواوترین دروستکراوە، بە زانستی خۆی ئاگاداری هەموو ئەو شتانەیە، کە دروستی کردوون" ئیتر بەر لە دروستکردنیان بێت، یان لە کاتی دروستکردنیان یان دوای دروستکردنیان (بۆ ئەو و زانستەکەی جیاوازیی نییە)[1]، پاشان هەر ئەو زاتەیە مرۆڤ و کات و شوێنی دروست کردووە، هەر ئەوە دەزانێت چی بووە و چی دەبێت، یان چ شتێك بەر لە بوونی دەبێت و ڕوودەدات.

## ئایا ئێمە ناچارین؟ ئایا مرۆڤ لە کردەوەکانیدا مافی هەڵبژاردنی هەیە؟

مرۆڤ لە هەندێ شتدا ناچارە و لە هەندێکی تردا مافی هەڵبژاردنی هەیە، بۆ نموونە: ئێمە لە بابەتی لە دایکبوون و مردن و ماوەی ژیانماندا ناچارین، لە دیاریکردنی دایك و باوك و کەسە نزیکەکانماندا مافی هەڵبژاردنمان نییە و ناچارین، بەڵام لە هەندێ شتی تردا مافی هەڵبژاردنمان هەیە، وەك: کردنی نوێژ و نەکردنی، باوەڕهێنان و کافربوون، بەڵام لەگەڵ ئەم هەڵبژاردنەیشدا" ویستی ئێمە بەستراوەتەوە بە ویست و ئیرادەی خوداوە، واتە: خوای گەورە لە هەڵبژاردنی کارێك و نەکردنی کارێکدا، گەر بیەوێت ڕێگریمان لێ دەکات، بەڵام وا بڕیاریداوە، کە هەڵبژاردن بە دەستی مرۆڤ بێت و پاشان لەسەر ئەم هەڵبژاردنە

[1] زێدەیەکی وەرگێڕە بۆ بەرچاوڕوونیی زیاتر.

لێپێچینەوەی لەگەڵ بکات" ئەمەیش واتای ئەم ئایەتەیە: ﴿ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ التكوير: ٢٩

واتە: "ویستی ئێوەیش نایەتەدی، مەگەر کاتێك پەروەردگاری جیهانییان بیەوێت و ویستی لەسەری بێت".

دەکرێت بە ڕێگەیەکی کرداری بابەتی ناچاربوون و هەڵبژاردنی بۆ ڕوون بکەینەوە: پەروەردەکار کوپێکی شوشە ئامادە بکات و بە منداڵەکە بڵێت: "ئایا دەتوانیت ئەم کوپە فڕێ بدەیتە سەر زەوی بۆ ئەوەی بیشکێنیت": منداڵەکە وەڵام دەداتەوە: "بێگومان دەتوانم". ئەمجارە پەروەردەکار پرسیاری لێ بکات: "ئەی چ شتێك ڕێگرتە؟" منداڵەکە لە وەڵامدا دەڵێت: "ئەمە کارێکی هەڵەیە و ناکرێت بیکەم". ئینجا پەروەردەکار دەڵێت: "خوای پەروەردگار ﷻ لە ئەزەلەوە زانیویەتی تۆ ئەم کوپە ناشکێنێت، چونکە تۆ کەسێکی باشیت، هەر لە ئەزەلەوە زانیویشیەتی منداڵی خراپ ئەم کارە دەکات. ئایا کەس هەبووە ڕێگریت لێ بکات، تا ئەم کارە نەکەیت؟ یان کەسێك هەبووە منداڵە خراپەکە ناچار بکات بۆ شکاندی؟ دەی بزانە ڕێگەی هیدایەت و گومڕاییش بەم شێوەیەیە". پاشان پێی بوترێت: "مرۆڤ نازانێت خوای گەورە چیی لەسەر نووسیوە، تۆیش بۆ زانینی ئەوەی لەسەرت نووسراوە داواکراو نییت، بەڵکو تۆ لەسەرتە، کە بزانیت زانستی خوای گەورە فراوان و گشتگیرە" لەوانە زانستی قەزا و قەدەر، تۆ تەنیا بەرپرسیاری لە ویست و ئیرادەی خۆت لە جێبەجێکردنی فەرمانەکان و نەکردنی قەدەغەکراوەکان، ئەمەیش لە چوارچێوەی دەسەڵات و ئیرادەی تۆدایە".[1]

[1] سەیری (الأسئلة العقائدية عند الأطفال والإجابة عليها، د. بسام العموش) بکە، (لا ١٤٥)، هەروەها سەیری (احفظ الله يحفظك، محمد الدبيسي) بکە، (لا ٧١، ٧٢). سەیری (الإيمان بالقضاء والقدر، د. محمد الحمد) بکە، (لا ١٨٥).

## بۆچی هەندێ خەڵك ڕێنوێنی کراون بۆ ڕێگەی ڕاست و هەندێکی تر نا؟

خوای گەورە بە فەرمایشتی خۆی ڕێنوێنیی سەرجەم خەڵکی کردووە: ﴿ وَهَدَيْنَٰهُ ٱلنَّجْدَيْنِ ﴾ البلد: ١٠.

واتە: "بەڕاستی ئێمە ڕێنوێنیمان کرد بـۆ ڕێگـەی ڕاسـت، بـەئازادی دەتوانێت ببێتە کەسایەتییەکی ئیماندار و سوپاسـگوزار، یـان بێبـاوەڕ و خوانەناس". ڕێنوێنی (الهدایە): بریتییە لە ڕوونکردنـەوە و شـیکردنەوەی ڕێگەی ڕاست و دروست بۆ مرۆڤ، بە جۆرێك حەق ڕوون بێت و ناحـەقیش ڕوون. خوای گەورە تەواوی مافی هەڵبژاردنی داوەتـە دەسـتی مرۆڤـەکان، هەیانــە ڕێگــەی ڕاســت هەڵدەبــژێرێت و هەیشــیانە ڕێگــەی ناڕاســت هەڵدەبژێرێت.[1]

## مادام خودای گەورە لە ئەزەلەوە نووسیبێتی کێ لە ئێمە هەڵە دەکات و گومڕا دەبێت، ئەی بۆچی سزامان دەدات؟

ئەمە زانستێکی خواییە، مرۆڤ هیچ زانیاریی لەبارەیەوە نییە، ئەوەی هەیەتی تـەنیا گومـان و وەهـم و نەفامییـە، مـرۆڤ لەسـەر ئـەو کـار و کردەوانەی دەیانکات لە ژیانی دونیــادا لێپێچــینەوەی لەگـەڵ دەکرێـت. بەندە هیچ بوارێکی بۆ نییە زانستی نادیار (غەیب) بزانێت، چارەنووسـی نووسراو دەبێتە بەڵگـە بـۆ ڕابـردوو، نـەك بـۆ داهـاتوو" هـەروەها پێـی

---

[1] بڕوانە (الأسئلة العقائدیة عند الأطفال والإجابة علیها، د.ب سام العموش)، (لا ١٥٦)

دەوترێت: "خوای گەورە کاروبارەکانی دونیای بۆ نوسیوویت... ئەی بۆچی کارە بەسوودەکان دەکـەیت و کـار زیانبەخشـەکان ناکـەیت؟!" دەکرێـت نموونەیەکی بـۆ بهێنرێتـەوە و پێـی بوترێـت: "ئەگـەر کەسـێك ویسـتی گەشتێك بکات بۆ وڵاتێك، گەشـتەکە دوو ڕێگـەی هـەبوو، ڕێگەیـەکیان سەلامەت و ئەویتریان ناسەلامەت، کەسەکە کام ڕێگەیـە هەڵدەبـژێرێت؟ بێگومان ڕێگەی یەکەمیان، بە هەمان شێوە ڕۆیشتن بەرەو ڕۆژی دواییش ئاوەهایە، مرۆڤ ئەو ڕێگـە سـەلامەتە هەڵدەبـژێرێت، کـە دەیگەیەنێتـە بەهەشت - کە بریتییە لە جێبەجێکردنی فەرمانەکان و دوورکەوتنەوە لـە قەدەغەکراوەکان -، بۆیە ئەگەر چارەنووس بەڵگە بوایە بۆ خـەڵك" ئـەوە نەمانـدەتوانی کەسـی تاوانبـار بگـرین، چـونکە ئـەوکات لەسـەر کـارە خراپەکانیان بەڵگەیان بە قەدەر و چـارەنووس دەهێنایـەوە، بۆیـە لەسـەر مرۆڤ پێویستە بە فەرمانی خودای موتـەعال قایـل بێـت و خـۆی بداتـە دەست پەروەردگاری، چـونکە خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ ﴾ الأنبياء: ٢٣

واتە "پرسیار ناکرێت لەوەی کە خـوا دەیکـات، لـە کاتێکـدا ئـەوان پرسیاریان لێ دەکرێت و موحاسەبە دەکـرێن". خـەڵك، خـەڵکی ئـەوە و فەرمانیش فەرمانی ئەوە.[1]

---

[1] سەیری (الإيمان بالقضاء والقدر، د. محمد الحمد) بکە، (لا ١٣٠، ١٣٤)

## خودا بۆچی ئێمەی دروستکردووە؟ ئەم گەردوونە چییە؟ ئەی بۆچی ئاژەڵانی دروستکردووە؟

پــەروەردگار دەفــەرموێت: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾ الذاريات: ٥٦

واتە: "بێگومان مــن پــەری و ئــادەمیزادم تــەنیا بــۆ ئــەوە دروســت کردووە، کە بمپەرستن و فەرمانبەردارم بن"، کەواتە بەڕاستی خوای گەورە بۆ ئامانجێك دروستی کــردووین و ســوودی بــۆ خۆمــان هەیــە - ئــەویش پەرستنی خودای پاك و بێگەردە -، وای کردووە ئەنجامەکانی ڕۆژی دوایی بەگوێرەی کردەوەکان بێــت، بەهەشــت بــۆ چــاکەکارانە و دۆزەخــیش بــۆ خراپەکاران، ئەم گەردوونەیش هــەمووی دروســتکراوی پــەروەردگارە" بــە جوانترین و وردیترین و تۆکمەترین شێوە دروســتی کــردووە، ئاسمانــەکان و زەویــی دروســتکردووە و ئەســتێرەکانی بــە ئاسمانــدا بڵاوکردوونەتــەوە، ئەســتێرەکانیش نیشــانە و بەڵگــە و جــوانین. خــۆری دروســتکردووە، تــا گــەرمیمان پــێ ببەخشــێت، یارمــەتیی گەشــەکردنی ڕووەك دەدات و میکرۆب و نەخۆشییەکان لەناودەبات، ئاژەڵەکانیشی دروستکردووە و بــۆ مرۆڤی ڕام هێناون، کە گۆشتەکانیان دەخۆن و بــۆ ســواری و گواســتنەوە بەکاری دەهێنن. خــوای گــەورە دەفــەرموێت: ﴿ وَٱلْخَيْلَ وَٱلْبِغَالَ وَٱلْحَمِيرَ لِتَرْكَبُوهَا وَزِينَةً ۚ وَيَخْلُقُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾ النحل: ٨

واتە: "هەروەها چەندان جۆری ئەسپ و ماین و هێستر و گوێدرێژی بۆ

بەدیهێناون، تا بۆ سواری و گواستنەوە بەکاریان بهێنن، سەرەڕای دیمەنی قەشەنگیان شتی تریش دروست دەکات، کە ئێستا ئێوە نایزانن".

زەویی بە جۆرێك سازاندووە، کە بۆ نیشتەجێبوون بگونجێت، ئەم شتانەی بەر لە دروستکردنی مرۆڤ دروستکردووە... ئەمەیش لە ڕووی ڕێزلێنانەوەیە، کە خوای گەورە تایبەتی کردووە بە مرۆڤ، ئەمە سەرباری ئەوەی هەموو شتێك یاد و سوپاسی پەروەردگار دەکەن، هەر بۆ خۆیان خواپەرستن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ إِنَّهُ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا ﴾ الإسراء: ٤٤

واتە: "هیچ شتێك نییە لەم بوونەوەرەدا، کە تەسبیحات و ستاییش و سوپاسی ئەو زاتە نەکات، بەڵام ئێوە لە تەسبیحات و ستاییشی ئەو شتانە تێناگەن، بەڕاستی ئەو زاتە هەمیشە و بەردەوام خۆگر و پشوودرێژ و لێخۆشبووە و چاوپۆشی دەکات".

## ئایا خودای گەورە ئەو کەسانە سزا دەدات، کە پێغەمبەریان بۆ نەهاتووە؟

ئەوان لێپرسینەوە و لێپێچینەوەیان لەگەڵ دەکرێت، چونکە خوای گەورە عەقڵی پێ بەخشیون، خوای پەروەردگار لە ڕۆژی دواییدا تاقییان دەکاتە و فەرمانیان پێ دەکات، ئەگەر سەرکەوتووبوون و وەڵامیان دایەوە" ئەوە دەیانخاتە بەهەشتەوە، خۆ ئەگەر سەرپێچیان کرد، ئەوە دەخرێنە دۆزەخەوە.

## بۆچی مرۆڤ هەیە؟

ئەم دونیایــە شــوێنی تاقیکردنەوەیــە، وەك بەشــی یەکــەم وایــە لــە ڕۆمانێکی دوو بەشی، ڕۆژی دواییش شــوێنی پاداشــت و لێپرســینەوەیە، سەندنەوەی مافەکانە لە ستەمکاران بــۆ ســتەملێکراوان" ئــەویش بەشــی دووەمی ڕۆمانەکەیە، کەواتە بوونی خراپەکاران و سزانەدانیان لە دونیــادا بۆ خۆی تاقیکردنەوەیە، ئەمە واتای کۆتایی شتەکە نییە، بەڵکو دەبێــت هەموویان ڕۆژی دوایی زیندووبکرێنەوە بۆ ئەوەی هەرکەسێکیان پاداشتی کردەوەکــــانی وەربگرێــــت" وەك پــــەروەردگار دەفــــەرموێت:
﴿ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ﴿٧﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ﴾ الزلزلة: ٧ - ٨

واتە: "جا ئەوەی بەقەدەر سەنگی گەردیلەیەك خێر و چاکەی کردبێت دەیبینێتەوە، ئەوەیشی، کە بەقەدەر سەنگی گەردیلەیەك شەڕ و خراپــەی هەبێت، دەیبینێتەوە".[1]

## بۆچی خوای گەورە خراپەکارانی دروستکردووە؟

خوای گەورە خەڵکی دروستکردووە و مافی تەواوی ئازادیی پێداون بۆ ئەوەی بــە ئــارەزووی خۆیــان چــاکە، یــان خراپــە بکــەن، تــۆ دەتوانیــت منداڵێکی عاقڵ و بەڕەوشت بیت، دەیشتوانیت خراپ بیت" بەڵام دەبێــت بەرگەی دەرئەنجامەکانی بگریت. ئــەوەیش بەخششــی پــەروەردگارە، کــە خراپەکاران دەتوان ببنە کەسانی باش، ڕۆڵی ئێمەیش لێرەدا ئەوەیــە لــەو

---

[1] سەیری (القواعد العشر: أهم القواعد في تربیة الأبنــاء، د. عبـدالکریم بکــار) بکــە، (لا ٢١،٢٢).

ڕووەوە هاوکاریان بین، ئەگەر ڕەتیان کردەوە و هەر سووربوون لەسەر خراپەکەیان، ئەوکات دەبێت ڕێگری لە خراپەکەیان بکەین و نەهێڵین زیان بە خەڵك بگەیەنن" ئەوەیش لەپێناوی ئەوەی خوای گەورە ئێمەی خۆش بوێت و پاداشتمان بداتەوە. خوای پەروەردگار هەموو شتێکی ئەم دونیایەی دروست کردووە، ئەم دونیایەیش شوێنی تاقیکردنەوە و گرفتارییەکانە، وەك دەفەرموێت: ﴿ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ ﴾ الملك: ٢

واتە: "هەر ئەو خۆی مردن و ژیانی بەدیهێناوە، تا تاقیتان بکاتەوە، ئاخۆ کێتان کردەوەی چاکتر و پەسەندترە؟ هەر ئەویش زاتێکی بالادەستە بەسەر بێباوەڕاندا، هەروەها لێخۆشبووە لە ئیمانداران".

یەکێك لەو گرفتارییانەیش بریتییە لە: بوونی شەڕ و خراپەکاری، لەسەر دەستی شەیتانەکان و ئادەمیزادە بەدکارەکان و لادەرەکان.[١]

## بۆچی هەندێ کەس بە ناتەواوی و کەمئەندامی لەدایك دەبن؟

ئەو جۆرە کەسانە خوای گەورە بە نەخۆشی و ناتەواوی تاقیی کردوونەتەوە، بۆ ئەوەی ئارامی لەسەربگرن و چاکەکانیان زیاد بکەن" هەروەها بۆ ئەوەی خوای گەورە بەخشش و بەهرەکانی خۆیمان بە بیر بهێنێتەوە، بەوەی پەروەردگار زۆربەمانی بەساغڵەمی دروستکردووە و

[١] سەیری (الأسئلة العقائدية عند الأطفال والإجابة عليها، د.بسام العموش) بکە، (لا ١٥٥).

لەسەر ئەمە سوپاسی بکەین، بێدەسەلاتیی خۆمانمان بـۆ دەربکـەوێت و تووشی لووتبەرزی نەبین، بەڵکو خاکەڕا بین و یارمەتیی یەکتر بدەین. لـە ڕۆژی لێپرسینەوەیشدا، ئەو کەسانەی کاری چاکیان کردووە بە لەشساغی لە بەهەشتی پڕ لە نازونیعمەتدا دەژین - بە ویست و پشتیوانیی خوا.[1]

## بۆچی هەژار و دەوڵەمەند هەن؟ ئەی بۆچی هەندێ لە خراپەکاران لە کۆشك دەژین و چاکەکارانیش لە کۆلێت؟

لەم دونیایەدا هەرچی نازونیعمەت و ڕۆزی هەیە، هـەموو لـە لایـەن خوای پاك و بێگەردەوەیـە. خـوای گـەورە بەنـدەکانی تـاقی دەکاتـەوە، هەندێ جار ڕزق و ڕۆزی دەداتە مرۆڤی چاك، بۆ ئـەوەی بـە بەخشـین بـۆ خەڵکانی تر تاقیی بکاتەوە، هەندێ جاریش لە پێدانی بەخشـش و ڕزق و ڕۆزی بێبەشی دەکـات بـۆ ئـەوەی بـە ئـارامگرتن و بەرگـەگرتن تـاقیی بکاتەوە، بەوەی دزی نەکات و داخ لە دڵ هەڵنەگرێت. هـەرکات مرۆڤـی باش لەم ژیانە کاتییەدا بە ئارامگرتن ژیا، پاداشتەکەی لە ڕۆژی دواییـدا ئێجگار گەورە دەبێت، بەلام ئەو کەسـەی بەخششـی زۆری پـێ درابـوو و نەیبەخشی بە خەڵکی و لەگەڵیان خراپ بوو، ئەوە لە ڕۆژی دواییـدا سـزا دەدرێت، چونکە قەدری بەخششەکانی خودای مەزنی نەگرتووە.

دەتوانین بڵێین خوای پەروەردگار ﷻ مرۆڤـەکانی بـە پلـە و ئاسـتی جیاواز دروست کردووە - لەوانە هەژار و دەوڵەمەند -، بۆ ئەوەی کەسـی دەوڵەمەنـد بەسـۆز بێـت لەگـەڵ هـەژاران، کەسـانی بـەهێز یارمـەتیی

[1] سەیری (ردود على شبهات متعددة، مرکز الفتوى إسلام ویب) بکە ٢٠٠٧/٦/٧.

لاوازەکان بدەن. حیکمەت و دانایی خوای گەورە ئەوەی خواستووە، کە خەڵکی لە هەموو شتێکدا جیاوازییان هەبێت، زمانیان جیاوازە و ڕەنگیان جۆراوجۆرە و خاوەن بنەچە و خووی جیاوازن" هەیانە چالاك و هەیشیانە تەوەززەل، هەیانە بەخششەر و هەیشیانە خۆویست و قرچۆك. بەخشندە و قرچۆك، لە ماڵ و ساماندا پلەیان جیاوازە، هەیانە هەژارە و هەیشیانە دەوڵەمەند، بەڵام هەموویان لە ژێر چەتر تاقیکردنەوەدان. هەژاری تاقیکردنەوەیە، وەك چۆن دەوڵەمەندییش تاقیکردنەوەیە. کەسی دەوڵەمەند تاقی دەکرێتەوە بەوەی ئایا هیچ دەبەخشێت؟ زەکات دەردەکات و خێر دەکات؟ هەژاریش تاقی دەکرێتەوە بەوەی ئایا ئارام دەگرێت؟ هەوڵ دەدات؟ ئایا بە گۆشە و کەناری زەویدا دەگەڕێت و کۆشش دەکات؟ ئایا بەرتیل وەردەگرێت، یان دزی دەکات؟ هەموو ئەمانە تاقیکردنەوەن، بەڵام دەستەبەری بۆ هەردوولا هەیە: ڕزق و ڕۆزی بەدەست خودایە، هەژاری و دەوڵەمەندی هیچیان ڕێگری ناکەن لە چوونە بەهەشت و دۆزەخ، هەموویان بەگوێرەی ئەوەی هەیانە بەرپرسیارن. ئەگەر هەموو خەڵك لە یەك ئاستی دەوڵەمەندیدا بوایەن، ئەوە کەس خزمەتی کەسی تری نەدەکرد و کەس پێویستیی کەسی تری جێبەجێ نەدەکرد، بۆیە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿لِّيَتَّخِذَ بَعْضُهُم بَعْضًا سُخْرِيًّا وَرَحْمَتُ رَبِّكَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ﴾ الزخرف: ٣٢

واتە: "بۆ ئەوەی هەموان کاروباری یەکتر تەواو بکەن و کەڵك لە توانایی و لێهاتوویی یەکتر وەربگرن"، بەم شێوەیە شەمەندەفەری ژیان بەردەوام دەبێت، بەڵام لە حاڵی یەك چینیدا ژیان دەوەستێت.[1]

[1] سەیری (المربون وتساؤلات الأطفال، نوال الخليفة) بکە، هەروەها سەیری (الأسئلة

## بۆچی نەخۆش دەکەوین؟ بۆچی مرۆڤ تووشی بەڵا و نەهامەتی دەبێت؟

خوای گەورە هەموو مرۆڤێك تاقی دەکاتەوە بەوەی ئایا لەسەر نەخۆشکەوتن ئارام دەگرێت، یان توورە دەبێت؟ پەروەردگار پاداشتێکی زۆری ئەو کەسە دەداتەوە، کە ئارام بگرێت و لە ڕۆژی دواییدا باوەڕدار دڵخۆش دەکات... نەخۆشی و ناخۆشی و بەڵا و نەهامەتی و ئازارەکان هەموویان قەدەری خودای موتەعالن و بۆ بەرزکردنەوەی پلەی مرۆڤ دایناون، دڵ و ڕەوشتمان لە لووتبەرزی و لەخۆباییبوون پاك دەکەنەوە، هەر بەمەیش باوەڕدار بەهۆی نزاکردن و ئارامگرتنییەوە لە خوای پەروەردگار نزیك دەبێتەوە و باوەڕ و چاکەکانی زیاد دەبێت و خودایش خۆشی دەوێت. هەر لە سوودەکانی ئەم بەڵا و ناخۆشییانە ئەوەیە مرۆڤ قەدری لەشساغی و بەخششەکان دەزانێت. دەکرێت نموونەی ئۆتۆمبێلی بۆ بهێنینەوە، لێی بپرسین: "بۆچی ئۆتۆمبێل دروستکراوە؟ بۆ ئەوەی بڕوات، ئەی وانییە؟ ئەی بۆچی کۆمپانیای دروستکار ئیستۆپی (یان برێك)ی بۆ داناوە؟ ئەی ئەم ئیستۆپە (برێکە) دژیەك نییە لەگەڵ جووڵە و ڕۆیشتنەکەی؟ بەدڵنیاییەوە بەکارهێنانی ئیستۆپ بۆ سەلامەتی زۆر پێویستە، ئۆتۆمبێل بۆ لێخوڕین دروستکراوە، ئیستۆپەکانیش بۆ وەستان لە کاتی پێویستدا، بۆ ئەوەی خاوەنەکەی بە هیلاك نەبات" بەم شێوەیەش خوای پەروەردگار ﷻ ئێمەی دروستکردووە بۆ ئەوەی بە بەندایەتیکردن و

---

العقائدية عند الأطفال والإجابة عليها، د. بسام العموش) بکە، (لا ١٦٠).

بەخششەکانی لەسەرمان دڵخۆشمان بکات. هەر ئەو زاتەیشە، کە بەڵا و ناخۆشییەکانی دروستکردوون، ئەمەیش بۆ ئەوەی مرۆڤی بێئاگا لە ئەرکە گەورەکەی سەرشانی بە هۆش خۆی بهێنێتەوە، واز لە بێئاگای و غەفڵەتەکەی بهێنێت و یادی خوا بکات، داوای لێخۆشبوون بکات و ئارامی لەسەر بگرێت و چاوەڕێی پاداشتیش بکات.[1]

## ئایا ئەوە خوای گەورەیە، کە ئاژەڵ و زیندەوەرە زیانبەخشەکانی دروست کردووە؟

خوا بەدیهێنەری هەموو شتێکە، پەروەردگاری هەموو شتێکە، وەك چۆن بە توانا و دەسەڵاتی خۆی ئەم هەموو دروستکراوەی دروستکردوون، بە هەمان شێوە بە حیکمەت و داناییش دروستی کردوون، چونکە هەر ئەو دانا و کاربەجێ و زانایە" هەر ئەوە لە کاروکردەوەکان دەزانێت و ئێمە لێیان نازانین، چونکە ئەو زانست و زانیارییەی خوای گەورە پێی بەخشیون لە بەرامبەر زانست و زانیاری و دانایی ئەودا ئێجگار کەم و بچووکە، وەك دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا﴾ الإسراء: ٨٥

واتە: "لە زانیاری و زانست هیچتان پێ نەبەخشراوە، تەنیا شتێکی کەم نەبێت".

ئێمە ناتوانین لە هەموو ئەو حیکمەت و داناییانە تێبگەین، کە خوای گەورە ئاژەڵەکانی لەپێناو دروست کردوون، یەکێك لە حیکمەت و

[1] سەیری (الإيمان بالقضاء والقدر، د. محمد الحمد) بکە، (لا ١٥٢، ١٦٠). هەروەها سەیری (خلق الله الإنسان د. محمد راتب النابلسي، موسوعة النابلسي للعلوم الإسلامية) بکە.

داناییـــەکان دەرخســـتنی ڕێکـوپێکی و بێخەوشـــی ئـــەو زاتەیـــە لـــە دروستکراوەکان، لە بەرامبەر زۆری و بۆرییاندا، کە خـۆراکی هـەموویان دەدا" هەروەها هەنـدێ کـەس بـە تووشـبوونیان بـەو زیندەوەرانـە تـاقی دەکاتەوە، پاداشتیشیان لەسـەر دەداتـەوە، ئازایـەتی هەنـدێك کەسـیش دەردەخات کـاتێ ئـەم زیانبەخشـانە دەکـوژن، لـە بەرامبـەردا بێهێـز و دەستەوەستانیی مرۆڤ دەردەخات کاتێـك ئـازار دەچـێژێت و بەهۆیانـەوە نەخۆش دەکەوێت... بەهۆی زانستەوە سەلمێنراوە، کە ژمارەیەکی زۆر لـە دەرمانی بەسوود، لە ژەهری مار و هاوشێوەکانی وەردەگیرێـت" هـەروەها مارەکان مشکی کێڵگـەکان دەخـۆن، ئـەو مشـکانەی، کـە بـەروبوومی کشتوکاڵی لەناودەبـەن. ئەمـە وێـڕای ئـەوەی بەشـێکی ئـەم زینـدەوەرە زیانبەخشانە دەبنە خۆراکێکی بەلەززەت بۆ کۆمەڵە ئاژەڵ و زیندەورێکی بەسوود، کە لە کۆتاییدا بازنەیەك لە هاوسـەنگیبوونی ئـەو سرووشـت و ژینگەیە دروست دەکەن، کە خوای پەروەردگار بە باشـترین شـێوە بـەدیی هێناوە.[١]

## بۆچی دەبێت شەو و ڕۆژێك پێنج جار نوێژ بکەم؟

ئەو پەرستشانەی خوای پەروەدگار لەسەر ئێمەی فەرز کـردوون، بـۆ پاککردنەوەی دەروون و بەرزبوونـەی پلەوپایەمانـە، مانـدووبوونێکی زۆر کەمی دەوێت، بەڵام بەهۆیەوە پاداشتێکی ئێجگار زۆر بەدەست دێـت[٢]،

---

[١] سەیری (أسئلة طفلك الحرجة، أبو المجد حرك) بکە، (لا ٣١). هـەروەها سـەیری (الحكمة من خلق الحيوانات الضارة، محمد المنجد الإسلام سؤال وجواب) بکـە، مێـژووی بڵاوکردنـەوە ١٩٩٩/٦/٢٦.

[٢] سەیری (الإيمان والحياة، د. يوسف القرضاوي) بکە، (لا ٦).

لەبەر ئەوەی نوێژ پەرستشتێکی گشتگیرە و خوێندنەوەی قورئان و یادکردنی خودا و نزا و پاڕانەوە لەخۆدەگرێت" هەموو بەشەکانی بەندایەتیکردن بە جوانترین شێوە کۆدەکاتەوە، زۆر باشترە لەوەی ئەو پەرستشانە (خوێندنەوەی قورئان، یادکردنی خودا و نزاکردن) بەتەنیا بخوێنیت، کە هەموویان پێکەوە کۆدەبنەوە، هاوڕێ لەگەڵ بەندایەتیکردنی سەرجەم ئەندامەکانی جەستە.[1]

باوەڕداران بە نوێژەکانیان دڵخۆش دەبن، چونکە لەگەڵ خودا ﷻ دەبن، هەرچەندێك حەز بکەن لێی دەپاڕێنەوە و ئەویش وەڵامیان دەداتەوە. ئێمە بۆیە نوێژ دەکەین، چونکە پەروەردگارمان ﷻ فەرمانی پێ کردووین، ئێمەیش بەردەوام حەز دەکەین کارێك بکەین، کە خودا فەرمانی پێ کردووین. ئێمە خودا دەپەرستین، چونکە بەدیهێنەر و ڕۆزیدەرمانە، هەر ئەو شایەنی پەرستنە بەو نازونیعمەتە زۆرانەی پێی بەخشیووین، کە لە ژماردن نایەن، دەفەرموێت: ﴿ وَإِن تَعُدُّوا نِعْمَةَ اللَّهِ لَا تُحْصُوهَا ۗ إِنَّ اللَّهَ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ النحل: ١٨

واتە: (خۆ ئەگەر بێن و بتانەوێت نازونیعمەتەکانی خوا بژمێرن، ئەوە بۆتان ناژمێردرێت، بەڕاستی خوای پەروەردگار لێخۆشبوو و میهرەبانە".

ئەم بەندایەتییەی ئێمە دەیکەین (کە نوێژکردنە) بریتییە لە دەربڕینی خۆشەویستی و سوپاسگوزاریمان بۆ خوای پەروەردگار و دانانمان بە پێویستیی زۆرمان بەو زاتە، ئەمەیش بۆ ئەوەی لەشساغیمان بپارێزێت و لە کاروباری چاکەدا سەرکەوتوومان بکات و دوورمان بخاتەوە لە خراپە.

---

[1] سەیری (الوابل الصیب، ابن القیم) بکە، (لا ٢٣٤).

پەروەردگار هەرگیز پێویستی بەم بەندایەتیکردنە نییە، چونکە لە ئێمە و کـار و کردنـەوەکانمان بێنیـازە و هـیچ سـوودی پـێ ناگەیـەنن. بەندایەتیکردنەکان کۆمەڵە فـەرمانێکن بەهۆیانـەوە خـوای پـەروەردگار دەیەوێت ئێمە لەسەر ڕێگە و ڕێبازی پێغەمبەرەکەی ﷺ بیپەرستین، هەر ئەمەیشە واتـای هـەردوو شـەهادەتەکە: واتـە ئێمـە خـوای پـەروەردگار دەپەرستین لەسەر ڕێگە و ڕێبازی پێغەمبەری خوا.. هەروەها ئـەم جـۆرە بەندایەتیکردنانە هۆکارێکن بۆ ئێمە، تا بتوانین لە ڕێگەیانـەوە پاداشـتی گەورە وەربگرین و ببنە هۆی چوونە بەهەشتمان. حیکمەتی خوای گـەورە وا دانراوە، کە هیچ پاداشتێك نەدرێتە مرۆڤ، مەگـەر بـە کـردەوە، بۆیـە بەهەشت کالأی خوای گەورەیە - کالأیەکی گرانبەهایـە - پێویسـتی بـە بەهایەکی زۆر هەیە - ئەویش بەندایەتیکردنە -.[1]

## لە نوێژدا نزام کرد، کە خێرا گەورە ببم، بەڵام خودا وەڵامی نزاکەمی نەدایەوە!

نزاکردن کۆمـەڵێك ئادابی هەیە پێویستە ڕەچاو بکرێن، لە ئادابەکانی نزاکردن ئەوەیـە، کـە: پێویسـتە کەسـی نزاکـار ڕێـزی یاسـا و ڕێسـا و سوننەتەکان بگرێت، کە خوای گەورە بۆ بەڕێوەبردنی ئەم جیهانە داینـاون. ئێمە لە خودا دەپاڕێینەوە ئەویش لە بەرامبەردا ئەو کارە خێرە دەکـات، کە بۆ ئێمەی هەڵدەبژێریت.

---

[1] سەیری (أسئلة طفلك الحرجة، أبو المجد حـر) بکـە، (لا ٣٢). هـەروەها سـەیری (المربـون وتسـاؤلات الأطفـال، نـوال الخليفـة) بکـە، (لا ٣٥).، سـەیری (الأسـئلة الأطفـال والإجابـة عليها، د. بسام العموش) بکە، (لا ١٤٨، ١٥١).

لەوانەیە داوا لە باوکت بکەیت لە شەقامی ئۆتۆمبێلەکان پاسکیل لێبخوڕیت، بەڵام ڕازی نابێت، چونکە تۆی خۆش دەوێت و دەزانێت وەڵامنەدانەوەی داواکەت باشترە بۆت. هەر لە ڕێز و بەخششی خوای گەورە لەسەر ئێمە ئەوەیە، کە نزا و پاڕانەوەکانمان سێ جۆریان هەیە:

**یەکەم:** خوای پەروەردگار وەڵامیان دەداتەوە و دەیانهێنێتەدی.

**دووەم:** لە بەرامبەردا پەروەردگار بەڵا و ناخۆشییەك لەسەرمان لادەبات، کە لەوانەیە تووشمان بوایە.

**سێیەم:** بۆمان هەڵدەگرێت بۆ ڕۆژی دوایی، بۆ ئەوەی لەوێ شتی باشترمان پێ بدات، کە بەهەشتە.[1].

## بۆ وەکو هاوڕێکەم جوان نیم؟

چونکە خوای پەروەردگار هەرکەسێکی بەگوێرەی ئەو شێوەیە دروستکردووە، کە بۆی گونجاوە، هەموو دروستکراوێکیش جوانە، وەك پەروەدگار دەفەرموێت: ﴿ لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴾ التين: ٤.

واتە: "بەڕاستی ئێمە مرۆڤمان لە جوانترین شێوە و ڕێکوپێکترین شێوازدا دروستکردووە لە هەموو ڕوویەکەوە".

هەموو کەسێك بەو شێوازە بێهاوتایەی بۆی دروستکراوە، جیاوازە. هەرکەسێ، کە خودای مەزن زۆر بەجوانی دروستی کردووە، پێویستە لەسەری زۆر سوپاسی خودا بکات. هەرکەسێك لەو ئاستەدا نەبێت،

---

[1] سەیری (أسئلة طفلك الحرجة، أبو المجد حر) بکە، (لا ٣٢)، هەروەها سەیری (من اليوم لن تهرب من أسئلة طفلك المحرجة ، عبدالله عبدالمعطي) بکە، (لا ١١١).

پێویستە قایل بێت و قەبووڵی بکات. ئەوانەی شوکرانەبژێر و ئـارامگرن، پلە و پاداشتی ئێجگار گەورەیان هەیە.[1]

## ئەگەر خودای گەورە ئێمەی خۆش دەوێت ئەی بۆچی خراپەمان دەهێنێتە پێش؟

خوای گەورە لەپێناو جیاکردنەوەی کەسـی بـاش لـە کەسـی خـراپ، تاقیمان دەکاتەوە. لەوانەیشە پەروەردگار بۆیە مرۆڤەکان تاقی بکاتـەوە، بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە لای و بەردەوام لێی نزیك بن. بـەڵا و ناخۆشـییەکان تاقیکردنەوەن و خودا خۆشەویستانی خـۆی تـاقی دەکاتـەوە پێیـان، بـۆ ئەوەی پاکیان بکاتەوە و پلەوپایەیان بەرزبکاتـەوە و ببنـە پێشـەنگ بـۆ کەسانی تر، تا لەسەر ڕێگەی ئـەوان ئـارام بگـرن، بۆیـە پێغەمبـەر ﷺ دەفەرموێت: (**أشد الناس بلاءً الأنبياء، ثم الأمثل فالأمثل**).[2]

واتە: "ئەو کەسانەی لە هەموو خەڵك زیاتر تووشـی بـەڵا و ناخۆشـی دەبن پێغەمبەرانن، پاشان ئەوانە دێن، کە پلەیان نزم و نزمترە".

هەرکەسـەو بـە ئەنـدازەی ئیمانەکـەی تـاقی دەکرێتـەوە، ئەگـەر ئیمانەکەی بەهێز بێـت تاقیکردنەوەکـەی تونـد دەبێـت لەسـەری، بۆیـە دەبینین پێغەمبەران تووشی تاقیکردنەوە و بەڵا و ناخۆشیی گەورە بـوون" ئەوانەی شەهید کران، ئەوانـەی ئـازار دران، ئەوانـەی نەخۆشـی درێـژەی کێشا لەگەڵیان وەك ئەییوب عليه السلام و پێغەمبەریشمان ﷺ لـە مەککـە و

[1] سەیری (المربون وتساؤلات الأطفال، نوال الخليفة) بکە، (لا ٩٥).
[2] ئەلبانی لە "صحيح الجامع، ٩٩٢" دەریهێناوە.

مەدینــە زۆر ئــازار درا، وێــڕای هــەموو ئەوانــەیش زۆر ئــارامگربوو.. مەبەستەکە ئەوەیە: بەڵا و نەهامەتی و ئازار بە ئەندازەی لەخواترسـان و باوەڕی کەسی لەخواترس و باوەڕدار دەبێت.[1]

پاشان دەبێت لە دڵی منداڵ ئەوە جێگیر ببێت، کە: خوای پەروەردگار ﷻ هەرچیی بوێت دەیکـات و هەرچـی ویسـتی لەسـەر بێـت ئـەنجامی دەدات، پرسیار لە خودا ناکرێت لەوەی چی دەکـات، چـونکە زانـاترین و دادپەروەرترینی فەرمانڕەوایانە.

ئەمانــە کۆمەڵــە پرســیارێکن، کــە زۆر دووبــارە دەبنــەوە، بــۆ وەڵامدانەوەی هەر پرسیارێکی تر، یان پێشنیار و نموونـەی باشـتر، ئێمـە پێشـوازی لــە پەیوەندییــەکانتان دەکـەین لەسـەر پێگـەی ئـەلیکترۆنیی jarkaf@gmial.com

* * *

---

[1] سەیری (كيف تقولها لأطفالك، بول كولمان) بکە، (لا ١٥٦). هەروەها ســەیری (إذ أحب الله عبداً ابتلاه فهل هذا صحيح، ابن باز) بکە، لە ماڵپەری (الإمام ابن باز ﷺ).

# کۆتایی

له کۆتاییدا ئەمانه هەندێك ڕاسپاردەن، کـه پێمانوایـه لـه بـواری پەروەردەییدا گرنگییان هەیه:

– پێویسـته هەوڵـەکان بـۆ ڕۆشـنبیرکردنی دایکـان و باوکـان چڕبکرێنەوه له ڕێی سازدانی خولی پێگەیانـدنی چڕوپڕەوه، چـونکه ئـەم دوانه کۆڵەگەیەکی گرنگن بۆ بەرهەمێنانی کەسـانێکی خـاوەن بـەڵێن و خاوەن پەروەرده و هۆشیارییەکی دروست.

– نەخشەسازیکردن و بەرهەمهێنانی بەرنامەی ڕاگەیانـدن و فـیلم کـارتۆن، کـه خـاوەن ناسـنامەی ئیسـلامی بـن و لـه ڕووی هونـەری و دەرهێنان و کوالێتییەوه هاوتای ئەو پێشکەوتنه جیهانییانـەی ئێسـتابن، بۆ ئەوەی زۆرترین بینەر و گرنگیپێدانیان هەبێت.

– هانـدان و بەسـتنی کـۆنگره و سـازدانی توێژینـەوه لـه بـواری بەرنامه و ڕاگەیاندنه پەروەردەییەکانی منداڵانەوه، به جۆرێك ئەم کارانـه بەشداربن له دروستکردنی بەرهەمی تایبەت به خۆمـان و ناسـنامەمان" هەروەها ڕەخساندنی بەرنامەی جێگرەوەی دڵخۆشکردن و کاتبەسـەربردن بۆ مـنداڵان.[١]

– ئێستایشـی لەگـەڵ بێـت بەرهـەمهێنانی میـدیای عـەرەبی

[١] سەیری (مدى تأثير البرامج الإعلامية على تصورات الأطفال الإيمانية، د. بدر العـازمي، د. فهد اللميع) بکه، (ل ٢٤).

(ئیسلامی) لە بواری ڕۆشنبیریی منداڵاندا هەژار و لاوازە. ئەوەیشی، کە هەیە، تەنیا بریتییە لە وەرگێڕان و دۆبلاژکردنی پەیام و ڕۆشنبیریی ژینگەی جۆراوجۆر. هەر بۆیە پێویستە هەوڵەکان لەپێناو پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە لە کتێبخانەی عەرەبی (ئیسلامی)دا یەك بخرێن.

– بەرهەمهێنانی پرۆگرامی مەشق و ڕاهێنان لە بوارەکانی پەروەردەی ئیمانی بۆ منداڵ، پێگەیاندنی ڕاهێنەر و ڕاوێژکار بە دیاریکراوی لەم بوارەدا، بە جۆرێك بەرنامەکان ئاراستەی پەروەردەکاران و مامۆستایان بکرێن لە ئاستی جیاجیای فێرکردنی منداڵان، کە لە ناوەڕۆکیاندا، ڕەچاوی جیاوازیی تەمەن بۆ هەر توێژێکی پەروەردەیی و زانستی بکرێت.

– پێشخستنی پرۆگرامەکانی فێرکردنی فەرمی، بەجۆرێك هەموو لایەنە پەروەردەیی و زانیارییەکان لەخۆبگرن، چارەسەری پرسیارە ئیمانییە هاوچەرخەکان بکەن بە چارەسەرێکی سەردەمییانە و تێروتەسەل.

# ناوەڕۆك:

## بەشی دووەم

02 | THE CHILDREN'S FAITH QUESTIONS

# پرسیارە ئیمانییەکانی منداڵان

پەروەردەی ئیمانی بەشێکی بنەڕەتییە لە پەروەردەی منداڵ، بەڵکو پاشخانی سەرجەم لایەنەکانی تری پەروەردەیە بۆ ئەوەی بیکاتە پەروەردەیەکی ڕاستەقینە و کارا. منداڵ ـ بە زیرەکییە فیترەتییەکەی ـ هەرکاتێک زانیاریی ئایینی بۆ دێت، کۆمەڵە پرسیارێکی زۆری بە مێشکدا دێن، بۆیە زۆر گرنگە ـ بەتایبەت کاتێک پرسیارەکە زۆر پێویست بێت و لەناکاو نەبێت ـ دایک و باوک بەبایەخەوە گوێی بۆ بگرن و بۆ وەڵامدانەوەی تێبکۆشن.

بەڵام ئاساییشە، کە زۆرێک لە دایکان و باوکان زانیاریی تەواویان نەبێت، یان هەموو دایک و باوکێک شێوازی بڕواپێکەریان نەبێت، بۆیە لەوانەیە لە دەریای خەمەکانیدا نغرۆ بێت و ماوەکەی لێ تەسک بێتەوە، کە پێویستە تیایدا بگەڕێت و لەو ماوەیەدا وەڵامەکە ئامادە بکات؛ بەتایبەت کاتێک پرسیاری منداڵان ڕێکوپێک نابێت و بە شێوەیەکی هەڕەمەکی دەبێت، ئەویش لەمیانەی مامەڵەکردنی لەبابەتە بینراو و بیستراوەکاندا.

نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە
هەولێر - شەقامی ٣٠مەتری تەنیشت منارەی چۆلی

/TafseerOffice
+964 750 818 08 65
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com

